# بەشێك لە نامە و نووسراوەكانی

# ماركس ئەنگلس

# لینین



لە ئەلمانی و عەرەبییەوە

سەلام عەبدوڵڵا

(1)

ئەلمانیا 22.6.2002

## له پێناوی دامەزراندنی کۆمسیونێك بۆ وەرگێڕانی بەرهەمە هزرییەکانی بزووتنەوەی کۆمونیستی

هاوڕێیان: ئایا کرێکاران و زەحمەتکێشانی کوردستان، ئاشنا بوون بە هزری بیرمەندانی کۆمونیزم؟ ئایا ئیمە بە شێوەی زانستی لە هزری کۆمونیستی تێگەیشتووین؟ سەدانی پرسیار لەم چەشنە، یەخەمان دەگرن، ئەگەر ئازاو راستگۆ بین لە گەڵ خۆمان و جەماوەر، ئەوا دەڵێین، نەخێر. ئەوەی تا ئێستا بڵاوکراوەتەوە ناگەنە ژمارەی پەنجەکان. سەرەڕای ئەوەش، دەمێکە، بزووتنەوەی کۆمونیستی رەگی خۆی لە ریزی کرێکاران و زەحمەتکێشانی کوردستان داکوتاوە و هەزاران خۆبەختەر لە رێگایدا ژیانیان لە دەست داوە. یادی ئەو هاوڕێیانە بەرز و نەمر بێت. ئەوە دەنگدانەوەی کۆمونە، شۆرشی ئۆکتۆبەر، دەسەڵاتی شوورایی، خەبات لە دژی فاشیزم و بەرزکردنەوەی ئاڵای سووری هەموو کۆمونیستەکانی جیهان لە سەر رایخی ئەلمانی بە خۆبەختکردنی٢٠ملیون مرۆڤ لە گەلانی سۆڤێت و گەلانی تری قەڵای سۆسیالیزم، بوون بە هەوینی دامەزراندنی حیزبە کۆمونیستەکان و کۆبوونەوەی کرێکاران لەدەوری چرای رزگاری لە کویلایەتی کار و هەموو جۆرەکانی چەوسانەوە.

ئەوەی لەو هزرە بە خەڵکی کوردستان گەیشتووە، ناکا ٥٪!ئەوانەش بە پلەی یەکەم، بە رێگای ئەو هاوڕێیانە وەرگێڕدران کە شارەزاییان لە زمانی عەرەبی هەبوو.



وەك دەبینین، لەم بوارە کارێکی زۆر کەم کراوە. ئەم ئەرکە ئێستا کەوتووەتە ئەستۆی ئێمەو دەبێ ئەنجامی بدەین. هەڵبەت سەختی کاری وەرگێڕان بە گشتی و وەرگێڕانی نووسینەکانی مارکس و ئەنگلس کە بە رۆشنبیرییەکی دەگمەن نووسراون، بە تایبەتی، لەبەرچاوە، بەڵام چەندی تر دەست بەژنۆو ترسەوە لە بەرامبەر چیای بەرزی ئازادی مرۆڤایەتی راوەستین؟ چەندی تر لە نوقسانی، گلەییکردن و هەڵەکردن بترسین؟نەخێر، هەزار جاری تر، نەخێر بۆ ئەو هۆیانە کە بوون بە هۆی وەرنەگێڕانی بیری شیوعییەت.

ئەم بانگەوازە، بۆ هەموو ئەو هاوڕێیانەیە کە خۆیان بە هەڵگری بیروباوەری رێبازی شوعییەت دەزانن. با لە گەڵ ئەم ئەرکە، بە گیانی بەرپرسیارییەتی و دوور لە بۆچوونە جیاوازەکان و بەڕەوشتی بەرزی کۆمونیزم، رەفتار بکەین. ئەمە شەڕێکی دژوارەو دەبێ ئاڵاکەی هەڵگرین. بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە، پێویستیمان بە دامەزراندنی کۆمسیونێکە بۆ رێکخستن، بەدواچوونەوەو چۆنییەتی لە چاپدانی بەرهەمەکان.

نەترسانە بۆ پێشەوە!

٢٠٠٢/٥/٣١

ئەدرەسی پەیوەندی: baukiprawda@ aol.com

## ئەنگلس بۆ یوسف بلوخ لە کوێنگسبۆرگ[1]

لەندەن، لە ٢١/سێپتێمبەر/١٨٩٠

...بە گوێرەی رامانی مەتریالیستی بۆ مێژوو، دوا بڕیاردەری چرکەی دیاریکراو لە مێژوو، بەرهەمهێنان و بەرهەمهێنانەوەی ژیانی واقیعییە. لەمە بترازێ، نە مارکس و نە من نەمانگوتووە. بۆیە، ئێستا ئەگەر یەکێك ئەمە وەگۆڕێ بەشێوەیەك کە بڵێ لایەنی ئابووری، **تاقە لایەنی** بڕیاردەرە، ئەوا ئەو ڕستەیە دەکا بە رستەیەکی ئەبستراکت، پوك و بێ مانا.

بارودۆخی ئابووری بنچینەیە، بەڵام توخمە جۆراوجۆری سەرخانەکانیش– فۆرمە سیاسییەکانی خەباتی چینایەتی وئەنجامەکانی– دەستوورە پەیرەوکراوەکان لە لایەن چینە سەرکەوتووەکانی پاش جەنگێکی براوە،... هتد، فۆرمە یاساییەکان، تەنانەت رەنگدانەوەی هەموو ئەم خەباتە واقیعییانە لە مەغزی بەشداربووەکاندا، تیئۆری سیاسی،مافپەروەری وفەلسەفییەکان، تێڕوانینە ئاینییەکان و پەڕەسەندنی ئایندەیان بۆ سیستێمێکی دوگم– و هەروا کارتێکردنەکانیان بە سەر ئاراستەی خەباتە مێژووییەکان کە لە زۆر حاڵەتیشدا، بە وێنەیەکی سەرکەوتووانە، **فۆرمەکانیشیان** دیاری دەکات. ئەمە کارلێکردنی بەرامبەرکێی هەموو ئەم لایەنانەیە، کە دوایی، لە تۆیدا، بە ڕێگای هەموو لایەنە جۆربەجۆرە بێ کۆتاییەکانی رێکەوتەکان (واتە، لەو شت و ڕووداوانە کە پەیوەندی ناووەکییەکانی لە ناو یەکتریدا ئەوەندە دوورن یا سەڵماندیان سەختە، کە ئێمە وایان دادەنێین لە بەردەستدا نیین وبتوانین پشت گوێیان

[1] بەئەلمانی وا نووسراوە، کەچی بە عەرەبی نووسراوە (أنجلز الی ج. بلوخ).



بخەین) وەك پێداویستییەکی بزووتنەوەی ئابووری خۆی دەسەپێنێ. دەنا بەکارهێنانی تیئۆری لە سەر سەردەمێکی مێژوویی هەڵبژێردراو، ئاسانتر دەبێ لە شیتەڵکردنی هاوکێشێکی ساناى پلە یەك.

ئێمە بە خۆمان مێژووی خۆمان دروست دەکەین. بەڵام یەکەم جار، لە ژێر پێشەکی و مەرجگەلێکی زۆر دیاریکراودا، لە ژێریاندا، ئابوورییەکەیان چارەنووسسازە. بەڵام پێشەکی و مەرجی سیاسییەکەش..هتد، تەنانەت ئەو ترادیستیونە کە لە مێشکی مرۆڤەکان دەخولێنەوە، گەرچی چارەنووسسازیش نین، رۆڵی خۆیان دەگێڕن .

دەوڵەتی(بروسیا)ش بە هۆی بڕیاردەری مێژوویی، بە هۆی ئابووری، پێکهات و پەڕەی سەند. کەچی، سەختە بە بێ ماندووبوونێکی زۆرەوە، دووپاتی بکەینەوە کە لە نێو وەڵاتە زۆر بچوکەکانی ئەلمانیای باکوردا، خودی براندنبۆرگ، پیویستییە ئابوورییەکە دیاری کرد بە بێ هیچ هۆیەکی تر (پێشی هەر شتێك، حەقیقەتی چوونە ناو کاروباری پۆڵەندا بە هۆی موڵکایەتی برووسیا و پاشان لە پەیوەندی سیاسی جیهانی چارەنووسسازیشەوە بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی سولالەتی نەمسا)بۆ ئەوەی ببێ بە گەورەترین هێزو لە ناویدا، ئابووری و جیاوازی زاراوەو لەکاتی ریفۆرماتسیون جیاوازی ئاینی، باکور لە گەل باشوور پێکبهێنێت.

هەروا بە سەختی دەڕەخسێ، راڤەی ئابووری بۆ هەر دەوڵەتێکی بچوکی رابردوو و ئێستای ئەلمانیا بکرێت، یا ریشەی گۆرینی پیتە بێدەنگەکانی ناو زمانی رەسمی کە بە هۆی جیوگرافیاوە، رێگرێك لە زنجیرە چیاکانی باشوور تا

تاونوس پێکدەهێنێ، درزێکی رەسمی بەناو ئەلمانیا بەرفراوان دەکا، بەبێ ئەوەی مرۆڤ خۆی نەکات بە گاڵتەجاری.

دووهەم جار، مێژوو بۆخۆی وا دەکا، دوا سەرئەنجام، هەمیشە لە نێو کێشەی ویستە زۆرەکانی تاکەکان بۆ پێشەوە دەچێ، هەر یەکێکیش لە وانە بەرێگای مەرجە تایبەتییەکانی ژیان، دەکرێ بەوەی، کە هەیە. کەواتە، بەم شێوەیە، ژمارەیەکی بێ کۆتایی لە هێزی یەکبڕ پێکدەهێنن، گروپگەلێکی بێ کۆتایی لە هێزی هاوسەنگی لاتەریب(متوازی الأضلاع)، لێیانەوە ئەنجامێك وەردەگرن—سەرئەنجامی مێژوویی—دەردەچێت، کە دەکرێ ئەمیش وا ببینرێت، وەك بەرهەمی کارتێکردنی هێزێك، بەگشتی، **ناهۆشیارو** بە بێ ویست ببینرێت. چونکە ویستی هەر تاکێك، ویستی تاکێکی تر رێگای لێ دەگیرێت و ئەوەی لێ دەردەچێت، شتێکە کەس نایەوێت. مێژوو ئاوا تا ئێستا هاتووە بە شێوەی پرۆسێسێکی سرووشتی ولە ناوەڕۆکیشدا لە ژێر رکێفی بزووتنەوەی هەمان یاسایە. بەلام لەوەوە، کە ویستی هەر تاکێك—لەوانەی هەر یەکێکیان دەیەوێت، بەقەد ئەوەی بونیادی جەستەو بارودۆخی دەرەکی، لە دواییدا بارودۆخە ئابوورییەکەیە(یا بارودۆخی خودی کەسەکە یا بارودۆخی گشتی کۆمەڵگا)پاڵیان پێوە دەنێ—ناگەن بەوەی دەیانەوێ پێی بگەن، بەڵکو لە ناوەندێکی گشتی، لە ئەنجامێکی هاوبەشدا دەتوێنەوە، ناشکرێ ئەو سەرئەنجامە وا هەڵهێنین کە=0. بە پێچەوانەوە، هەر تاکێك لەو ئەنجامەو بەوەی بریتییە لە بەشێکی، بەشدارەی دەکا.

ماوە، تکات لێ بکەم، ئەم تیئۆرییە لە سەرچاوە ئۆرگیناڵەکەیەوە، نەك لە دەستی دوو، لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەی. بەڕاستی، بەم شێوەیە زۆر ئاسانترە.



مارکس بەدەگمەن شتێکی نووسیوە، بە بێ ئەوەی ئەم تیئۆییە رۆڵی تێدا نەگێڕابێ، بەتایبەتی **لویس پۆناپەرت لە ١٨برۆمیر** باشترین نموونەیە بۆ بەکارهێنانی. هەروا لە سەرمایەدا، لە چەندین شوێن ئاماژەی بۆ کردووە. لە گەڵ ئەوەشدا، دەتوانم ئێستا سەرەنجت بۆ نووسینەکانم رابکێشم: شۆڕشی بەرێز ئۆجین دوهرینگ لە زانست، لودڤیغ فیورباخ و کۆتایی فەلسەفەی کلاسیکی ئەلمانی، کە زۆر بە وردی باسی مەتریالیزمی مێژووییم کردووە وزانیارییەکانم تێدایە .

ئەوەی کە لە لایەن گەنجەکانەوە هەندێ جار، زیاد لە پێویست، قورسایی لە سەر لایەنە ئابوورییەکە دەنێن، تا رادەیەك مارکس و من قەرزاربارین. ئێمە لە بەرامبەر نەیارەکانمان، بە توندی باسی ئەم پەرەنسیپە سەرەکییە باس کردووە کە ئەوان ئینکاری لێ دەکەن. ئێمە بە بەردەوام کاتی، شوێن و هەلی پێویستمان نەبوو تا مافی کارلێکردنە بەرامبەرییەکانی توخمە بەشداربووەکانی تریش، بدەین.

بەلاّم کاتێ مەسەلەکە پەیوەندی بەوەوە هەبوو توێژێکی مێژوو بخەینە بەرچاو، واتە بۆ بەکارهێنانی پراکسیس، مەسەلەکە جیاواز بوو و لێرەدا ناشێ هیچ هەڵەیەك بکرێت. تەنها بەداخەوە کە زۆر جار ئەوە دێتە پێشێ، کە مرۆڤ وا دەزانێ بە تەواوەتی لە تیئۆرییە نوێیەکە تێگەیشتووەو دەشتوانێ جێبەجێی بکات، کاتێ لە رستە سەرکییەکانی تێدەگات، ئەمەش نەك هەموو جار بە درووستی لێی تیگەیشتوون. من ناتوانم ئەم گلەییە لە هەندێ لە"مارکسی"نوێ نەکەم، لێرەشدا شتی سەرسورهێنەر بەدەستهێنراوە...

٢٠٠٢/٦/٢١

سەرچاوە:

Nach: Der sozialistische Akademiker.1.Jg.Nr.19.Berlin, 1.Oktober1895

Karl Marx/Friedrich Engels: Werke, Bd, 37, S.463-465



## ماركس بۆ أ.سورج

لەندەن، لە٢٧ئەیلول/١٨٧٧

ئەم قەیرانە[٢]خاڵی وەرچەرخانی نوێیە لە مێژووی ئۆروپا. رووسیا–من مەرجەکانی ئەویێ لە سەرچاوە رووسییە رەسەنەکانم خوێندووەتەوە، نارەسمی و رسمییەکان(ئەمەی دواییان دەست ناکەون لە لای چەند کەسێك نەبێ، بەڵام دەستکەوتنیان بۆ من بەرێگای برادەران لە پترسبۆرگ رێکخرا)–زۆر دەمێکە لە پێش راپەرین راوەستاوە، هەموو توخمەکانی ئامادەن و تورکە زەریفەکانیش، بە دەستوەشاندنێك، نەك تەنها لە لەشکرو دارایی رووسی، بەڵکو لە کەسایەتی ناو خێزانی پاشایەتیش کە سەرکردایەتی لەشکر دەکەن (تزار، جێگرکەی و شەش کەسی تر لە خێڵی رۆمانۆف) بە چەندینساڵ، پەلە بە تەقینەوەکە دەکەن. راپەرینەکە بە گوێرەی یاسای گەمەکە دەستی پێدەکات، لەگەڵ هەندێ گەمە لە سەر ئاوازی دەستووری و پاشان هەراوهورییایەکی زۆر جوان دێتە پێشەوە. گەر سرووشتی دایك، بەشێوەیەکی تایبەتی لە دژمان نەبێ، ئەوا دەژین بۆ دیتنی ئەو گاڵتەجاڕیە!

ئەو قسە بەتاڵ و هیچ و پوچانە کە قوتابییە رووسەکان دەیهێنن، هەر بەخودی خۆی تەنها نواندنێکی بێ نرخە، کەرچی تەنها نواندنە. هەموو بەشەکانی ئابووری، رەوشت و بیری کۆمەڵگای رووسی لەوپەڕی دارزاندنە.

[2]/مەبەست جەنگی رووسیا و تورکیایە لە ١٨٧٧–١٨٧٨

ئەم جارەیان شۆڕش لە ڕۆژهەڵاتەوە کە تا کاتی ئێستاماندا، قەڵای پتەوو لەشکری یەدەکی کۆنەپەرەستی بوو، دەستی پێدەکاتەوە.
بەڕێز بسمارك خۆشحال بوو بە دیتنی ئەو لێدانە، بەڵام بە بۆچوونی ئەم، نەدەبوو بگاتە ئەو رادەیە. گەر رووسیا زۆر لاواز بێ، ناتوانێ نەمسا لە ژێر رکێفی خۆی رابگرێ وەك لە جەنگی فەرەنسی و بروسی کردی! ئەگەر مەسەلەکە لەوێ گەیشتە رادەی شۆڕش، چی بە سەر دوا گارانتی خێزانی هوهنزولری پاشا دێت؟
گرنگترین شت لە کاتی ئێستاماندا ئەوەیە، پۆلۆنییەکان(لە مەملەکەتی پۆلۆنیا) هێمن بن. لەم ساتە وەختەدا، هیچ راپەڕینێك لەوێ بەرپا نەکرێ! ئەوکات یەکسەر بسمارك دەجمێ، هەروا شۆفینیزمی رووسیش سەرلەنوێ دەچێتەوە پاڵ تزار. ئەمما ئەگەر پۆلۆنییەکان بە پێچەوانەی ئەوە، چاوەڕوان بن تا مەسەلەکان لە بترسبۆرگ و مۆسکۆ ئاگر دەسەنێ و پاشان بسمارك وەك بەفادارێك دەستتێوەردەدا، ئەوکات بروسیا رووبەرووی– مەکسیکۆیەکی تایبەت بەخۆی دەبێ[٣]. ئەم مەسەلەیە چەندین جار بە زەبر سەپێنراوە بەسەر هەموو ئەو پۆلۆنییانە کە پەیوەندیم پێیانەوە کردووە، ئەوانەی دەتوانن کارتێکردنیان بە سەر هاووەڵاتییەکانیان هەبێ.

[3]/ مەبەست لە هێرشی سێهەمی ناپلیونە بۆ سەر مەکسیك(١٨٦٢–١٨٦٧): دەستتێوەردانی لە جەنگی ناوخۆ لە نێوان حکومەتی کۆماری و یاخییە پاشاییەکان. ئەم سەرچڵییە رووبەرووی شکستییەکی گەورە بوو. مەبەستی ناپلیون ئەوە بوو، مەکسیك بخاتە ژێر رکێفی فەرەنسا.



لە بەراوردکردن لە گەڵ قەیرانی رۆژهەڵات، قەیرانی فەرەنسی[٤] رێك رووداوێکی لاوەکییە. لە گەڵ ئەوەشدا هێوادارین کۆماری بۆرژوازی سەربکەوێت، دەنا گەمە کۆنەکە سەرلە نوێ دەستی پێدەکاتەوە، وزۆر جار هیچ نەتەوەیەك توانای ئەوەی نییە هەمان گێلایەتییەکان دووبارە بکاتەوە.
لەگەڵ شرینترین هیوای دۆستانەی هاوسەرەکەم و خۆم
موخلیستان
کارل مارکس

[4]/ مەبەستی توندبوونەوەی ناکۆکی سیاسییە لە فەرەنساساڵی١٨٧٧ بە هۆی هەوڵی ماریشاڵ ماکماهون سەرۆك کۆمار بۆ گەڕانەوەی پاشایەتی.

## مارکس بۆ ف.أ. سورج

لەندەن، لە ١٩ تشرینی یەکەم/١٨٧٧

...ڕۆحێکی بۆگەن لە حزبەکەمان لە ئەلمانیا دەردەکەوێت، هێزەکەیشی لە نێو جەماوەر بە قەد هێزەکەی لە نێو رابەرەکانی (چینی باڵاو ((کرێکاران))) نییە. ئەو سازان وڕێککەوتنە لە گەڵ لاسالییەکان بوو بەهۆی سازان و ڕێککەوتن لە گەڵ کەسە هەڵپەرستەکانی تریش: لە بەرلین(بڕوانە مۆست)لە گەڵ دوهرینگ و((سەرسووڕماوەکان))ی، دەبووایە ئێمەش لە گەڵ چەتەیەکی تەواویش لە سەگکەلێکی نیوە پێگەیشتوو و دکتۆری سەرووی دانایی لە خاوەن بڕوانامەکان بڕۆین کە دەیانەوێت هێڵێکی((ئیدیالی باڵا))بە سۆسیالیزم بدەن، واتە خستنەبەری لە بنچینە مادییەکەی(کە پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی بابەتییانەی جددی هەیە لە هەر کەسێك بییەوێت بەکاری بهێنێت)بە میتۆدۆلۆژیای سەردەم لە گەڵ خواوەندەکانی دادوەری، ئازادی، یەکسانی و برایەتی. دوکتۆر هۆشبرخ کە گۆڤاری دواڕۆژ دەردەکات، نوێنەری ئەم هێڵەیە وپێموایە((ڕێگاکەی)) بۆ ناو حیزب-بە((خاوێنترین))نیاز بڕیوە، بەلاّم من هەرگیز بایەخ بە((نیازەکان)) نادەم. هیچ شتێك لە بەرنامەکانی لە گۆڤاری (دواڕۆژ) سووك و ڕسواتر نییە کە لەوانەیە بە((پڕپووچییەکی خاکی)) ڕۆشنایی ببینێ.

کاتێ خودی کرێکاران وەك بەڕێز مۆست و هاوکارەکانی دەبن بە هونەرمەندی پیشەیی، هەمیشە زیانی((تیئۆری))بەرهەمدەهێنن. ئەوانە هەمیشە ئامادەن



بچنە ریزی سەرشێواوەکانی ئەو جەماعەتە کە ناویان((ڕۆشنبیر))ە. ئێمە دەیان ساڵ بە رەنج و ماندوبوونێکی زۆرەوە بەسەر برد، تا بە شێوەیەکی تایبەتی سۆسیالیزمی یۆتۆپی، لە سەری کرێکارە ئەلمانەکان دەرکرد- ئازادبوونیان لەوە، هێشتی لە باری تیئۆری(و پاشان بە کردەوەش)لە فەرەنسی وئەنگلیزەکان سەرکەوتووتر بن-. سۆسیالیزمی **یۆتۆپی** کە یارییەکە بە تابلۆی وەهمی لە سەر بونیادی کۆمەڵگای داهاتوو، سەر لە نوێ وەك ئاگری ناو دەغڵ بە شێوەیەکی ئاستنزم، نەك تەنها لە بەراوردکردن لە گەڵ یۆتۆبییە فەرەنسی و ئەنگلیزە گەورەکان، بەڵکو تەنانەت لە گەڵ...(وایتلیگ)یش، بلاّودەبێتەوە. زۆر سرووشتییە، یۆتۆبییەکان کە پێشی سەردەمی سۆسیالیزمی رەخنەگری ماددیانە، ئەم سۆسیالیزمە دواییە وەك ئاودانێك لەناو هەناویدا شاردووەتەوە، بەلاّم ئێستا، پاش بەسەرچوونی کاتەکەی، ناتوانێ ببێ بە شتێکی تر، تەنها هیچ وپوچ، نزمی نەبی و لە پەنجەی پێیەوە تا بان سەری کۆنەپەرەست....

٦/١٨

## ئەنگلس بۆ مارکس

مانشیستەر، لە ٢٦ی ئەیلول/١٨٥١

خۆشەویستم مارکس

بەقەد ئەوەی مەسەلەکە پەیوەندی بە مێژووی جەنگی لتیشۆوە[5] هەیە، لە تێڕوانینی سەربازیشەوە لەرادەبەدەر بێ ئاستە و لە هەندێ شوێن بەشێوەیەکی راستەوخۆ ساختەیە. بێجگە لەو حەقیقەتە قووڵە کە دەڵێ، **دەبێ هێز بە هێز رووبەروو ببێتەوە**، و ئەو دۆزینەوەیە کە نەفی ئەقڵ دەکا کە شۆڕش ناتوانێ سەربکەوێت تەنها ئەگەر گشتی نەبێ(و پاشان،دەقاودەق، ئەگەر هەرگیز رووبەڕووی هیچ بەرگرییەك نەبێ، وبە گوێرەی ماقووڵ ئەگەر شۆرشی بۆرژوازی بوو) . بێجگە نیاز پاکی لە لەناوبردنی((سیاسەتی ناوەوە))ی بێفەڕ، واتە شۆڕش بە تایبەتی لە لایەن دیکتاتۆرێکی سەربازییەوە،سەرەڕای کافینیاك و ویلیش، هێشتا نەدۆزراوەتە. بێجگە لەم داڕشتنە سیاسییە پڕ مانای تێڕوانینی ئەو بەڕێزانە کە لە بارەی شۆڕش هەیانە، ئەوا ئێمە دەبێ ئەمانەی خوارەوە، لە تێڕوانینی سەربازییانەوە لە بەرچاو بگرین:

[5]/ ئاسەواری جەنگی داهاتوو، لێکۆڵینەوەیەك بە قەڵەمی ئەفسەر تیشو، سەرۆك ئەرکانی لەشکری شۆڕشگێر لە بادن لە ساڵی١٨٤٩، لە نیویورکر شتات تسایتونگ.



یەکەم دیسپلینی پۆلآیین، کە دەتوانێ بەتەنها زامنی سەرکەوتن بکات، رێك پێچەوانەی((دواخستنی سیاسەتی ناوەوە)) ولە دیکتاتۆرییەتی سەربازی. ئەم دیسپلینە لە کوێوەوە سەرچاوە وەردەگرێ؟ هەرچۆنێك بێت ئەو بەرێزانە، لە بادن و بالاتینیت هەندێ تاقیکردنەوەیان وەرگرتووە. ئەوە راستییەکی رۆشنە کە پەرتەوازی لەشکر و شلبوونی دیسپلینی تەواو تا ئێستا مەرج و سەرئەنجامی گشت شۆڕشێکی سەرکەوتوو بوون. فەرەنسا لە١٧٨٩ تا١٧٩٢پێویستی بە سەرلەنوێ رێکخستنی لەشکرێك هەبوو، تەنها پێکهاتبێت لە٦٠٠٠٠–٨٠٠٠٠پیاو–ئەوە لەشکری دومۆرییبز بوو– ئەم لەشکرە سەرلەنوێ خۆیی هەڵوەشانەوەو گەر رێ بە گوتن بدرێ، تا کۆتایی١٧٩٣، هیچ لەشکرێکی رێکخراو لە فەرەنسا نەبوو...

ئەدی کێ دیسپلینی بۆ ناو لەشکر هێنا لە کاتی یەکەم شۆڕشی فەرەنسا؟ جەنەڕاڵەکان ئەم کارەیان نەکرد، ئەمانە کە پشتگیری ودەسەلآتیان وەرنەگرتبوو بەسەر ئەو لەشکرە پیادەییە، تەنها پاش بەدەستهێنانی چەند سەرکەوتنێك نەبێ لە شۆڕش، بەڵکو ئەو ئیرهابە بوو، کە دەسەلآتە مەدەنییەکان بەکاریان دەهێنا لە جێبەجێکردنی سیاسەتەکانی ناوەوە....

٦/١٨

## ئەنگلس بۆ مارکس

مانشیستەر، لە ٧تشرینی یەکەم١٨٥٨

...مەسەلەکە لە گەڵ جۆنس زۆر قیزەوەنە. لێرە کۆبوونەوەیەکی کردو بە دوورو درێژی بە گوێرەی هێڵی هاوپەیمانی نوێی قسەی کرد. پێدەچێ مرۆڤ پاش ئەم مەسەلەیە، ناچار بێ بگاتە ئەو بڕوایە کە بزووتنەوەی پرۆلیتاری بەریتانی لە شێوە شارتیییە کلاسیکی کۆنەکەی، دەبێ بە تەواوەتی لەناو بچێ، پێش ئەوەی بتوانێ بەشێوەیەکی نوێ گەشە بکات و توانای ژیانی ببێ. لە گەڵ ئەوەشدا وا دێتە پێش چاوم کە بزووتنەوەی جۆنسی نوێ، گەر لە گەڵ هەوڵە کۆنە زۆر یا کەم سەرکەوتووکان کۆبکرێتەوە لە پێناوی ئەم جۆرە هاوپەیمانییە، بەکردەوە بەو راستییە بەستراوە کە پرۆلیتاریای ئینگلیزی لە کاتی ئێستادا، زیاد یا کەم بووە بە بۆرژوا. بەشێوەیەك، ئەم نەتەوە لە هەموو نەتەوەکانی تر بۆرژوازیترەو وەك دەردەکەوێ، لە کۆتاییدا مەسەلەکە، ئامانجی ئەوەیە ببێ بە خاوەن ئۆرستوکراتی و ویرۆلیتاریای بۆرژوازی **لە پاڵ** بۆرژوازییەت. بێ گومان ئەم مەسەلەیە تا رادەیەکی دیاریکراودا بیانوی خۆی هەیە بۆ نەتەوەیەك، هەموو جیهان دەچەوسێنێتەوە. لێرەدا، تاقە شت کە



دەتوانێت نەختێك یارمەتی بدا، ئەوەیە، چەند ساڵێکی زۆر بەد پێش بێ، بەلاّم پێناچێ لەمەودوا بە سانایی پێش بێ، لەوەتی ئاڵتوون دۆزراوەتەوە.[6]

[6]/ گۆڕانی جۆنس بۆ سیاسەتی هاریکاری لە گەڵ بۆرژوازی، بوو بە هۆی پچڕاندنی پەیوەندی لە نێوان خۆی و مارکس. لە یەکی شوبات/١٨٥٩ مارکس بۆ ویدیمبێر نووسی: پەیوەندیم بە ئێرنست جۆنس پچراند. سەرەڕای ئاگادارکردنەوە یەك لە دوای یەکەکانم و سەرەڕای ئەوەی پێشبینی ئەمەی ئێستا روویدا دەقاودەق، کرد– ئەوەی کە خۆی وێران دەکا و حزبی شارتییەکان لێکدادەپچڕێنێ– درێژەی دا لە هەوڵدان بۆ جێبەجێکردنی هەوکاریکردن لەگەڵ بۆرژوا رادیکالەکان. ئێستا پێوێکی موفلیسە و ئەو زیانە کە بە پرۆلیتاریای ئەنگلیز گەیاندی، زیانێکی گەورەیە. ئاساییە ئەم گوناهە راستدەکرێتەوە، بەلاّم چرکەیەکی زۆر گونجاو بۆ کردەوە لە کیس چوو. لەشکرێك لەبەر چاوت راگرە، سەرکردەکەی لە رۆژی جەنگ دەچێتە پاڵ دوژمن)).

## مارکس بۆ ڤیلهێلم بلوز له هامبۆرگ*

لەندەن١٠/نۆڤەمبەر/١٨٧٧

...من"هاوار ناکەم"(وەك هاینه وتی*)، ئەنگلسیش له من گەمتر. هەردووکمان هیچ نرخێك بۆ ناودەرهێنان، دانانێین. بۆنموونه، وەك بەڵگەیەك، له سەر قیزهاتنەوەمان له هەموو شێوەیەکی تاکپەرەستی، له کاتی ئینتەرناسیونال، زۆربەی ئەو مانۆڤەرانه که له وەڵاتە جیاجیاکانەوە دەگەیشتن وبه پێهەڵدان بێزاریان دەکردم، قەت بلاوم نەدەکردنەوە، هەروا قەت وەڵامیشیانم نەدەدایەوە، چەند دانەکیان نەبێت، ئەوانەش بە هۆی سەرزەنشت کردنیان.
یەکەم مەرجی من و ئەنگلس بۆ کارکردن له ناو کۆمەڵەی نهێنی کۆمۆنیستەکان(یەکێتی کۆمونیستەکان) ئەوە بوو، هەموو ئەوەی له دەستوودا *** هەیە له بارەی **پروپوچی ئۆتۆریتێت**، لابرێت.(لاسال له پاشاندا له دژی ئەم ئاراستەیە راوەستا)....

دەستنووس

یەکەم جار له(یاقوبی حەقیقی)، ژمارە٥٦٥، له ١٩٠٨/٣/١٧بلاوکرایەوە

سەرچاوە: K.Marx und F.Engels, Ausgewaelte Werke, S706-707

**هۆنراوەی هەژدەهەمی هاینه له Lyrisches Intermezzo

*** مەبەستی یەکێتی یەکسانیخوازانه.



- تێبینی خۆم: *تێبینی خۆم: ئەم نامەیە زۆر کورتە، بەڵام هەڵویستی رابەرانی کۆمونیزم پیشان دەدا له بارەی ئۆتۆریتێت. هیوادارم هەندێ برادەر لەم بارەیەوە بۆچوونەکانیان راست بکەنەوە !

# دادگاییکردنی

# کۆمونیستەکانلە کوێلن

لندەن، چوارشەمە، ١دیسەمبەر ١٨٥٢ فریدریك ئەنگلس

من زۆر لەو بڕوایەم کە ئێوە، بە ڕێگای ڕۆژنامەگەری ئۆرووپی، ڕاپۆرتێکی زۆرتان بە دەست گەیشتووە لە بارەی دوا دادگاییکردنە گەورەکەی دژ کۆمونیستەکان و ئەنجامەکەی لە بڕووسیا. بەڵام لە بەر ئەوەی تاقە یەك ڕاپۆرت لەو ڕاپۆرتانە دەست ناکەوێت، ڕووداوەکان تۆزێك بە شێوەیەکی درووست پیشان بدەن، و لە بەر ئەوەی ئەو ڕووداوانە تیشکی درەوشانە دەخەنەسەر ئەو ئامرازە سیاسییانەی وا کیشوەری ئۆرووپا بە کۆتکراوی دەهێڵنەوە، بۆیە منیش بە پێویستی دەزانم، بگەڕێمەوە بۆ باسکردنی ئەم دادگاییکرنە.

بە هۆی نەهێشتنی مافی کۆمەڵەو کۆبوونەوەکان، حیزبی کۆمونیست یا پرۆلیتاری، وەك حیزبەکانی تر، توانای دامەزراندنی ڕێکخستنێکی شەرعییانە بۆ خۆی لە کیشوەرەکە، لە کێس چوو. سەرباری ئەوەش، سەرکردەکانی لە وەڵاتەکانیان دەرکران. بەڵام هیچ حزبێکی سیاسی ناتوانێ بە بێ ڕێکخستن هەبێ. ئەگەر بۆرژوا لیبراڵەکان، وەك خوردە بۆرژوا دیموکراتەکان، لە بارودۆخ و



ئیمتیازی ماددیدا بن، و ئەگەر بە هۆی پەیوەندی ڕۆژانەی کۆنی نێو ئەندامەکانیان، توانیان تا ڕادەیەك شوێنی ئەم جۆرە ڕێکخستنە بگرێتەوە، بەڵام پرۆلیتاریای بێ بەش لەم جۆرە بارودۆخە کۆمەڵایەتییە و لە سەرچاوەی پوولی، ناچار بوو، لە ناو یەکێتییە نهێنییەکان، بۆ ئەم ڕێکخستنە بگەڕێ. بۆیە چ لە فەرەنسا یا لە ئەلمانیا، چەندین کۆمەڵەی نهێنی، پێکهات. ئەمانەیش، لە ١٨٤٩وە، پۆلیس یەك لە دوای یەکیان ناسییەوەو وەك ڕێکخراوگەلێکی پیلانگێڕ شوێن پێیانی هەڵدەگرت. هەر وایش بوو، زۆربەی ئەم کۆمەڵانە، ڕێکخراوی پیلانگێڕ بوون، بۆ ئەوە دامەزرابوون، حکومەتی باڵادەست بڕوخێنن،– ترسنۆکە ئەوەی لە بارودۆخێکی دیاریکراودا، هەوڵی ئەوە پیلانگێڕێ نەدا، وەك چۆن گێلایەتی بوو، لە بارودۆخێکی تردا پێی هەستن– بەڵام سەرباری ئەوەش، کۆمەڵەگەلێکی تر هەبوون، دەیانویست بە ئارمانجی بەرین و بەرزتر بگەن– کۆمەڵەیەك بوون، دەیانزانی کە ڕوخاندنی حکومەتی باڵادەست، تەنها قۆناغێکی گوازتنەوەیە بۆ خەباتێکی مەزنتر، وەهەوڵی دەدا حزبێك پێکهێنێ، خۆیشی ناوکەکەی بێ، و ئامادەی بکات بۆ دوا جەنگی چارەنووسساز کە هەر دەوایە، زوو یا درەنگ،لە ئۆرووپادا،نەك تەنها دەسەڵاتی((زۆرداران)) و (چەوسێنەران))و((زەوتکەران))لەناوببەن، بەڵکو دەسەڵاتێکی بەهێزترو ترسناکتر کە لە گەڵیدا بەراورد ناکرێن لە ناوببات، ئەوەش دەسەڵاتی سەرمایەیە بە سەر کار.

ڕێکخستنی حیزبی شیوعی کە لە بەرەی پێشەوە ڕاوەستابوو لە ئەلمانیا، لەم چەشنە ڕێکخراوە بوو. ئەم حیزبە، بە دەسپێك لە((بەیاننامە))کەیدا (کە لە ساڵی١٨٤٨) بڵاوکرایەوە،وئەو بابەتە گەشەپێدراوانە لە زنجیرە ووتارێك

((شۆرش و دژی شۆرشی له ئەلمانیا)) که له(نیویۆرك دیلی تریبونه) بڵاوکرانەوه، وهەرگیز رۆژێك خۆیی به ئیلزیون نەبەستەوه. دەیتوانی بەو شۆرشه هەستێت، کەی و چۆن بیوستبا، که بێ کومان ئامانجەکەی به کردەوه به دەست دەهێنێت. ئەو حزبه هەستا به تۆژینەوەی ئەو هۆیانه که بزووتنەوه شۆرشگێرەکانی ساڵی١٨٤٨بەدواوەوەی هاتن و هۆکانی سەرنەکەوتنیان.

له بەر ئەوەی ئەو حیزبه وای دەبینی، ناکۆکییه کۆمەڵایەتییەکانی نێو چینەکان له بنچینەی گشت تێکۆشانێکی سیاسی، بەرز دبێ، بۆیه هەستا به لێتۆژینەوەی ئەو مەرج و بارەدۆخانه که دەتوانرێ و دەبێ له سێبەریدا، چینێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو، بۆ نوێنەرایەتیکردنی گشت بەرژەوەندییەکانی نەتەوه و پاشان بۆ حوکمڕانی سیاسی پێشوازی لێبکرێت. مێژوو پیشانی حزبی کۆمونیستی دا، به چ جۆرێك سەریهەڵداو گەشەی کرد، پاشی ئیریستوکراتی عەقاری له سەدەی ناوەڕاست و زلهێزی پوولی سەرمایەداره یەکەمەکان که پاشان دەستیان به سەر دەسەڵات گرت و چۆن جێگای کۆمەڵایەتی و دەسەڵاتی سیاسی ئەم گروپه پوولییه له سەرمایەداران له ژێر فشاری سەرمایەداره پیشەسازیی بەهێزبوو، لابرا–لەو کاتەی دەست به بەکارهێنانی هەڵم کرا–و چۆن دوو چینی تر به هەمان شێوه، دەسەڵاتخوازیان، رادەگەیەنن، واته چینی خورده بۆرژوا و چینی کرێکاره پیشەسازییەکان.

ئەزمونی شۆرشگێڕی عەمەلی له١٨٤٨–١٨٤٩دووپاتی درووستی ئەو نرخاندنه تیئۆرییانەی کرد، که بەرەو ئەو سەرئەنجامه گەیشت و وتی، دەبێ یەکەم جار رۆڵی دیموکراتی خورده بۆرژوازی بێ، پێش ئەوەی چینی کرێکاری کۆمونیست ئەو هیوای دامەزراندنی دەسەڵاتەکەی هەبێ، له ناو بۆتەی خەباتی بەردەوام



وسیستێمی کویلایەتی کرێکرته که له ژێر دەسەڵاتی بۆرژوازی دەیهێڵتەوه، له ناوببات. له بەر ئەم هۆیانه، نەدەکرا رۆخاندنی حکومەته باڵادەستەکان له ئەلمانیا، ئامانجی راستەوخۆی رێکخراوی نەهێنی کۆمونیستەکان بێ. ئەو رێکخراوانه بۆ ئەوه دانەمەزران ئەم حکومەتانه برۆخێنێ، بەڵکو بۆ روخاندنی حکومەتی سەرکێشەکان که هەر دەبێ، ئەوڕۆ یا سبەی، شوێنی ئەم حکومەتانه بگرێتەوه. لەم حاڵەتدا، ئەندامانی رێکخراوەکه دەیانتوانی، هەر کەسێکیان به جیا، له کاتی گونجاو، به کردەوەیش، له دژی بارودۆخی باو، پشتیوانی چالاکانەیان له بزووتنەوەی شۆرشگێڕی دەکرد. بەڵام ئامادەکردنی ئەم جۆره بزووتنەوەیه، به شێوەیەك،غەیری شێوەی بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی کۆمونیستی به نهێنی له نێو جەماوەر، له ئەرکەکانی کۆمەڵەی کۆمونیستەکان نەبوو. زۆربەی ئەندامەکانی ئەم کۆمەڵەیه له بنەڕەتەوه به شێوەیەکی باش، لەم پرەنسیپه باوه تێدەگەیشتن، تا رادەیەك، کاتێ ئارەزوومەندی و خۆبردنەپێش له لای هەندێ ئەندام له هەوڵدان بوون بۆ گۆرینی کۆمەڵه بۆ رێکخستنێکی پیلانگێڕ، له پێناوی شۆرش بەرپاکردن به بێ خۆئامادەکردن، خێرا ئەم جۆره ئەندامانه له کۆمەڵه دەردەکران.

هیچ یاسایەك له جیهان نەیدەتوانی، بیانوو بهێنێ بۆ ناونووسکردنی ئەم جۆره کۆمەڵەیه بەوەی که رێکخستنێکی پیلانگێڕانەیه، کۆمەڵەیەکی نهێنییه، به مەبەستی هەستان به خیانەتی گەوره، دامەزراوه. گەر پیلانگێڕانیش بوایه، ئەوا پیلانگێڕانێك نەبوو له دژی حکومەتی ئێستا، بەڵکو له دژی ئەو حکومەته که جێی دەگرێتەوه. حکومەتی بڕووسی ئەمەی دەزانی، و هەر ئەم هۆیەشه، ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوه، بۆچی ئەو ١١تاوانبارکراوانه له زیندانی تاقه

کەسی بۆ ماوەی ١٨مانگ مانەوە، حکومەتیش ئەو ماوەیەی بەکارهێنا بۆ سەیروسەمەرترین فێڵی یاسایی. بیهێننە بەر چاوتان: پاش ٨مانگ تەوقیف، چەند مانگێکی تریش هێشتنیانەوە بۆ درێژەپێدان بە لێپێچینەوە((چونکە هیچ بەڵگەیەکیان پێ نییە لە دژیان، بۆ سەلماندنی تاوانێك پێی هەستابن))!وکاتێ تاوانبارکراوەکان لە پێشی دادگای سوێنخۆران راوەستان، نەیانتوانی بە هیچ کارێکی پێزانراوی پێشوەخت کە سیمای خیانەتی گەورەی هەبێ، بخەنە پاڵیانەوە. لە گەڵ ئەوەشدا، هەموویان سزادران، و ئێستایش دەبینین بە چ شێوەیەك.

لە ئایاری١٨٥١تەتەرێکی کۆمەڵە دەستگیرکراو لە سەر ئەو بەڵگانەی کە لەلای دۆزییانەوە، دەستگیرکردنەکانی تر کرا. یەکسەر کارمەندی پۆلیس بروسی کە ناوی(شتیبر)ە، فەرمانێك بۆ بەدواچونی پەلوپۆکانی پیلانگێڕانێکی وەهمی لە لەندەن بەدەست گەیشت. ئەمیش پێکرا چەند بەڵگەنامەیەك لە بارەی ئەوانەی لە کۆمەڵە جیابوونەوەو پاش دەرکردنیان، دەست بکەوێت. ئەوانەش بەڕاستی لە پاریس و لەندەن کۆمەڵەیەکی نهێنی رێکخستبوو. ئەو بەڵگەنامانە بە رێگای تاوانێکی دووگانەگی دەستیان کەوتبوو. پۆلیس توانی بەرتیل بە کابرایەك بەناوی رۆیتەر بدەن، ئەمیش بیرۆی سکرتێری ئەو کۆمەڵەیە بڕێ و بەڵگەنامەکان دزی. بەڵام ئەمە هەموو مەسەلەکە نەبوو. ئەم دزیکردنە بوو بەهۆی دۆزینەوەی ئەوەی پێدەڵێن، پیلانگێڕی ئەلمانی و فەرەنسی لە پاریس و سزادانی بەشداربووەکانی، بەڵام هیچ هەڵویستێك لە پەیوەست بە کۆمەڵەی کۆمونیستەکانی نەدا بە دەستەوە. بەم بۆنەیەوە دەڵێن، پیلانگێڕییەکەی پاریس هەندی گێلەپیاوی چاوچنۆك و خوێڕی سەرپەرشتییان دەکرد، و کەسێك



پێشتر بە تاوانی تزویرکردن سزادرابوو و لە پاریس وەك جاسوسی پۆلیس کاریکردووە(ناوی شرڤالە). ئەو نەزانانە کە بە بەیاننامەی هاتوهاوارانەو دێڕو دەربڕینی رەنگاورەنگ، هەڵخەڵەتان.ئەوانە بانگەواز بۆ خوێنرشتنیان دەکرد، بەمە حەقارەتی سیاسی لە رادەدە بە دریان دەرخست.

بەم شێوەیە، دەبوایە پۆلیسی بروسی بکەوێتە گەڕان بۆ دۆزینەوەی نوێ. لە باڵوێزخانەی بروسی لە لەندەن بەراستی بەشێکیان دامەزراند بۆ پۆلیسی نهێنی. جاسوسێکی پۆلیس بە ناوی گرایف لە ژێر ناوی کارمەندی باڵوێزخانە هەڵدەستا بە کارە دزێوەکەی،—بەراستی، تەنها ئەم شێوە کارە، بەسە، بۆ ئەوەی هەموو باڵوێزخانەکانی بڕووسیا بخرێنە دەرەوەی یاسای جیهانی، کارێکە تەنانەت نەمساوییەکان پێی هەڵنەستاون. لە ژێر دەسەلاّتی، بازرگانێك بەناوی فلوری( لەناوچەی بازرگانی لەندەن )کاریدەکرد، پیاوێکە خاوەن هەندێ پارەوپوولەو پەیوەندی لە لەگەڵ خەڵکانێك تا رادەیەك بەرێز، هەیە. گیانلەبەرێکە، لەو گیانلەبەرە رەوشتنزمانە کە بۆگەنترین کار دەکەن بە پاڵنەرێك لە تێندێنسی سرووشتی بۆ ئەنجامدانی کاری ئاستنزمانە. هەروا جاسوسێکی تر هەبوو، ئەویش کارمەندی بازرگانی بوو بە ناوی هیرش، بەلاّم گومانی جاسوسێتی لێ کرا کاتێ گەیشتە لەندەن. ئەم خۆیی هاویشتە ناو ریزی هەندێ لە کۆچکراوە ئەلمانە کۆمونیستەکان. ئەوانیش بۆ ئەوەی ناسنامە راستەقینەکەی بناسنەوە، ماوەیەك لە نێو خۆیان سەبریان لەسەر کرد. خێرا پاژەکان دەسکەوتن لە سەر پەیوەندی بە پۆلیسەوە، لەو کاتەوە(هیرشی) بەرێز خۆیی وونکرد. سەرەڕای ئەوەی گشت توانایەکی لە دەست دەرچوو بۆ زانیاری کۆکردنەوە کە لەبریدا پارەیان پێدەدا، بە بێ کاری نەما. لە

خۆشارگەکەی لە کێنسیگتۆن کە بۆ جارێکیش چاوی نەکەوت بەو کۆمونیستانەی باسمان کرد، هەموو رۆژێك راپۆرتێکی وەهمی لە بارەی کۆبوونەوەی وەهمی کۆمیتەی ناوەندی وەهمی ئەو رێکخراوە پیلانگێڕە دەنووسی، رێك لە بارەی ئەو رێکخراوە کە پۆلیسی بڕووسی پێنەکرا دەسگیریان بکا. ناوەڕۆکی ئەو راپۆرتانە لەوپەڕی خرفی و بێ ئاستیدا بوو. هیچ ناوێکی راست نەبوو لە گەڵ واقیع، هیچ نازناوێك بە دروستی نەنووسرابوو. هیچ قسەیەك لە قسەی هیچ کەسێك نەدەچوو کە رەنگە کابرا کردبێتی. لە سەر بارودۆخی ئەم راپۆرتانە، هیرش پارەی لە فلوری مامۆستای وەردەگرت و هەرگیز نەیانتوانی بیسەلمێنن کە گریف((کارمەندی باڵوێزخانە)) ((دەستی تەڕ)) نەکردبێ لەم کارە ئابروچووانە. بەڵام حکومەتی پوروسی، هەرچەند کارەکە سەیر بێتە بەرچاو، ئەو درۆ ودەڵەسانەی بە راستییەکی پیرۆز دادەنا، ئەوچا مرۆڤ دەتوانێ بیهێنێتە بەرچاوی، ئەو جۆرە گواهییانە لە ماددەی تاوانبارکردن کە پیشاندرا لە بەردەم دادگای سوێندخۆران، چ هەراو فەرتەنەیەکی نایەوە. کاتێ دادپەروەرییەکە دەستی پێکرد، شتیبەر(کارمەندی پۆلیس کە پێشتر ناومان هێنا) وەك شایەت هاتە پێشەوەو پاش سوێنخواردن، دووپاتی راستی هەموو ئەو درۆدەڵەسانە کردەوە. بە شانازییەکی گەورەوە دووپاتی کردەوە کە یەکێك لە جاسوسە نهێنییەکانی، پەیوەندییەکی زۆر دۆستانەی هەیە لە گەڵ ئەو کەسانە کە لە لەندەن دەژین و دەبێ بە رێکخەرانی سەرەکی ئەو پیلانگێڕییە ترسناکە دابنرێن. بەراستی ئەم جاسوسە نهێنییە، لە واقیعدا، لە نهێنیدا دەژیا، چونکە لە ترسانەوە، بە درێژایی هەشت مانگ لە حەشارگەکەی کێنسینگتۆن خۆی شاردبووەوە بۆ ئەوەی بەڕاستی چاوی



بەکەوێت بە یەکێك لەوانەی بەڕاست بەشدارن لەو پیلانگێڕییە کە هەفتە بە هەفتە، وەك ئیدعای دەکەن، راپۆرتی لە سەر مەبەست، ووتەو کردەوە زۆر نهێنییەکانیان دەنووسی.

بەڵام هیرش و فلۆری بەرێز لە جانتاکەیاندا دۆزینەوەیەکی تریان هەڵگرتبوو. هەموو ئەو راپۆرتانە کە دروستیان کردبوو، سەرلەنوێ بە خۆیان دارشتبوویان بە وێنەی ((فایلی ڕاستی راپۆرتی کۆبوونە)) دانیشتنەکانی کۆمیتەی نهێنی باڵا کە پۆلیسی بڕووسی داکۆکی لە بوونی دەکرد. لەبەر ئەوەی شتیبەر بینی کە ئەو فایلانە بە شێوەیەکی سەرسورهێنەر جووتن لە گەڵ ئەو راپۆرتانە کە پێشتر لە لایەن هەمان ئەو کەسانەوە بەدەستی کەوتن، خێرا پێشکەشی سوێندخۆرەکانی کرد، و سەرلەنوێ پاش سوێندخواردن، رایگەیاند کە پاش لێکۆڵینەوەیەکی وردبینانە، گەیشتووە بە ئەوپەڕی باوەڕ کە ئەو فایلانە درووستن. رێك لەو کاتە، بەشی زۆری ئەو درۆدەڵەسە سەخیفانەی هیرش بڵاوکرایەوە.

ئەوجا مرۆڤ دەتوانی تەسەوری سەرسوڕمانی ئەو ئەندامە وەهمییانە بکا لەو کۆمیتە نهێنییە، کاتێ بیستیان چی لە بارەیانەوە دەگوترێ کە هەرگیز رۆژێك لە رۆژان بە خیالیشیان نەهاتووە. ئەوەی ناویان لێ نابوو غلیوم، ناوی ببوە لویس یا شارل، کەسانی تر گوایە لە لەندەن خیتابیان خوێندووەتەوە، بەڵام لە راستیدا لەو کاتە، لە شوێنێکی تری بەریتانیا بوون، و لە سەر کەسێکی سێهەم، گوایە نامەیان خوێندووە، کە هەرگیز وەریانەگرتووە، هەروا ئاماژە بەوە کراوە، کە بەرێکوپێکی هەموو پێنجشەمەیەك کۆبوونەوەیان کردووە، بەڵام راستییەکی ئەوەیە ئەوان وا راهاتبوون، هەموو هەفتەیەك لە چوارشەمە کۆدەبوونەوە، و

ناوی کرێکارێکیان هێناوه که بەحاڵ دەزانێ بنووسێ، وەك یەکێك لە دانەرانی نووسینی راپۆرتی کۆبونەوەکان و ئیمزاشیانی کردوون، وەك ئیدیعای دەکەن بەو سیفەتە. لە راپۆرتەکەیاندا، هەمووشیان ناچارکردووە، بەزمانێك بپەیڤن، زیاتر لە زمانی بەشێك لە بەشەکانی پۆلیسی بڕووسی دەچێ، بەلاّم بە هیچ شێوەیەك لە زمانی کۆمەڵەیەك ناچێ، زۆربەی ئەندامەکانی لە نووسەرانێك پێکهاتووە لە وەلاّتەکانیان ناوداریان هەیە. بۆ تەواوکردنی هەموو ئەوانە، پسۆلەیەکی پوولیان تەزویر کردبوو کە ئەو دوو ساختەچییانە وەریان گرتووە لە بەرامبەر وەرگرتنی فایلی کۆبوونەوەکانی سکرتێری وەهمی ئەو کۆمیتە ناوەندییە وەهمییە. بەلاّم بوونی ئەو کۆمیتە ناوەندییە وەهمییە، فێڵکارییەکە، کۆمونیستێکی غەدار بۆ (هێرش)ی بێچارە رێکخستووە.

ئەم تزویرە زەقە ئەوەندە ئابروچوانە بوو، دەبوایە بە تەواوەتی کارتێکردنەکەی رووبدا، بە پێچەوانەی کارتێکردنی مەبەستدار. سەرەڕای ئەوەی برادەرانی تاوانبارکراوی لەندەن، لە هەر توانایەك بۆ ئاگارکردنەوەی سوێندخۆران لە بارەی بارووDۆخی مەسەلەکە بێ بەش بوون، و سەرەڕای ئەوەی ئەو نامانە کە بۆ پارێزەرەکان دەنێردران، لەلایەن پۆستەوە دەستیان لەسەر دەگیرا، سەرەڕای ئەوەی کە بەڵگەنامەکان و ئیفادە دەسنووسەکانیان پاش سوێندخواردن کە هەر چۆنێك بێ، گەیاندیان بە دەستی پارێزەرەکانیان، رێگایان پێنەدرا وەك بەڵگەیەکی دادپەروەری بە دادگا بدرێ. لە گەڵ ئەوەشدا، توڕەیی گشتی لە پلەیەکی وا توند بوو، تەنانەت پارێزەرانی دەوڵەت و هەروا بەخودی شتیبەر–کە پاش سوێندخواردن کەفالەتی درووستی راپۆرتی کۆبوونەوەکانی کرد– دان بنێن بەوەی کە ئەو فایلانە ساختەکراون.



بەلاّم ئەو ساختەکارییە تاقە کار نەبوو لەو جۆرە کارانە کە پۆلیس پێهەستاوە. لە کاتی دادگاییکردنەکە دوو تا سێ رووداو لەم چەشنە روویدا. بەرێگای پەراوێزەکانەوە، پۆلیس تەزویری ئەو بەڵگەنامانەی کرد کە رۆیتەر دزیبوونی و بەو شێوەیەش ماناکەی تێکدرابوو. بەڵگەنامەیەکیان نوسیبوو پڕ لە درۆی شاخدار، بە خەتێك، لاسایی خەتی دوکتۆر مارکس دەکا، و ماوەیەکی زۆر بە نووسەری ئەو بەڵگەنامەیە دادەنا، تا پارێزەری دەوڵەت لە دواجار ناچار بوو دان بە ساختەکارییەکە بنێ. بەلاّم لە شوێنی پەردەهەڵماڵین لە سەر هەر بۆگەنییەکی پۆلیس، پێنج تا شەش بۆگەنی تری نوێ دەردەکەوت کە نەدەکرا دەستبەجێ پەردەیان لە سەر هەڵبدرێ، چونکی یەکسەر بەرگریان دەکردو لە بەر ئەوەی دەبوایە بەڵگەکان لە لەندەنەوە دەستبکەوێ و هەر نامەگۆڕینێك لە نێوان پارێزەرە و کۆمونیستە کۆچکراوەکان لە لەندەن، لەلایەن دادگاوە، وەك بەشدارییەك لەو پیلانگێڕییە وەهمییە، راڤەدەکرا!

ئەمما گریف و فلوری بە ڕاست ئەو کەسانە بوون کە وەك پێشتر وەسف کران، ئەوا ئەمە بەرێز شتیبر بە خۆی وەك شایەتێك لە قسەکانیدا، دووپاتی کردەوە. ئەوەی پەیوەندی بە(هێرش)ەوە هەیە، لە پێشی دادپەروەی پۆلیس لە لەندەن دانی نا بەوەی کە بە فرمانی فلوری و بە شدراربوونی، بەخۆی هەستاوە بە ((تەزویری سجلی کۆبوونەوەکان))و پاشان بۆ ئەوەی لە بەدواچوونی دادگا رزگاری بێ، بەریتانیای بەجێهێشت.

ئەو پەردەهەڵماڵینە لە سەر راستییەکان لە بەردەم دادگا زۆر ئابرووچوون بوو و حکومەتی رەنگ زەرد کرد. پێکهاتی ئەو یاساناسانە کە لەم دادگاییکردنە پێکهاتێك بوو، لە ناوچەی ڕاین هاوتای نەبینرابوو: شەش ئەشرافی

کۆنەپەرەستی تۆخ، چوار کەس لە خاوەن پوولە گەورەکان و دوو کارمەندی حکومەت. ئەمانە زۆر مەیلی ئەوەیان نەبوو، بیریان بەکاربهێنن لەو تۆپەڵە تێکوپێکچووەی ئەو بەڵگانە کە لە ماوەی شەش هەفتە لە بەردەمیان کەڵەکەیان کرد، شانبەشانی هاوارە بەرزەکان کە بە نەپچراوی لە گەوێیاندا دەنگیان دەدایەوەو دەیاگوت: تاوانبارەکان سەرکردەی پیلانگێرییەکەی کۆمونیستین، ترسناکن، ئامانجیان ئەوەیە هەموو پیرۆزێك بڕۆخێنن: موڵکداری، خێزان، ئاین، سیستێم، حکومەت و یاسا! لە گەڵ ئەوەشدا، گەر حکومەت لە هەمان کاتدا سەرەنجی چینە ئیمتیازدارەکان نەکێشابا بۆ ئەوەی کە ئازادی لەم دادگاییکردنە دەبێ بە هێمایەك بۆ لابردنی دادگای سوێنخۆران وبە خۆپێشاندانێکی سیاسی دادەنرێت،بە بەڵگەیەك لە سەر ئەوەی کە ئۆپۆزیتسیونی بۆرژوازی لیبراڵ ئامادەیە هاوکاری لە گەڵ توندترین شۆڕشگێڕی رادیکاڵ بکا، ئەو کاتە حوکم بە ئازادکردنیان دەدرا. سەرەڕای ئەوەش حکومەت پێی کرا، بە رێگای جێبەجێ کردنی یاسای سزادانی بڕووسی نوێ کە یاسایەکە، وەك دەڵێن کارتێکردنی بە سەر رابردوویش دەگرێتەوە، بیگەن بە دەرکردنی سزای زیندانی لە سەر حەوت تاوانبارکراو و ئازادکردنی تەنها چوار کەس. ئەو حەوت کەسە بۆ ماوەی جۆراوجۆر، لە نێوان سێ تا شەش ساڵ سزادران. بێ گوکان پێشتر ئاگاتان لێ بوو، کاتێ هەواڵەکەتان بەدەست گەیشت.

بە ئەنگلیزی نووسراوە
لە ١٨٥٢/١١/٢٩



لە رۆژنامەی نیویۆرك دیلی تریبونە، ژمارە ٣٦٤٥، لە ٢٢/دیسەمبەر١٨٥٢
ئیمزا: کارل مارکس
تێبینی: ئەم ووتارە بە عەرەبی لە ژێر ناوی(المحاكمه الاخيره فى كولونيا) بڵاوکراوەتە. بەڵام بە ئەلمانی لە ژێر ئەم ناوەوە بڵاوکراوەتەوە.

## ووتەی مارکس لە یادی دامەزراندنی
## The"Peoples Paper"
## لە ١٨٥٦/٤/١٤خوێندویەتەوە

ئەوەی بە شۆڕشی١٨٤٨نێودەبرێ، تەنها چیرۆکی رووداوێکی بچوك بوو، تەنها درز و قڵیشە بێ ئەرزشەکانی توێکڵی رەقی کۆمەڵگای ئۆرووپایە، بەڵام کەلێنەکەی ژێری دۆزییەوە. سەربانەکەی کە رەق دیارە، کرایەوە، ئۆقیانۆسێکی شەپۆلدار، پیشانداو تەنها پێویستی بە جماندنە، تا هەموو کیشوەری سەر بەردە رەقەکە، هەلاهەلا بکات. بە هاتوهاوار و شلووقی، ئازادی پرۆلیتاریایان راگەیاند، واتە نهێنی سەدەی نۆزدەهەم و شۆڕشی ئەم سەدەیە.

راستە کە ئەم شۆڕشە کۆمەڵایەتییە دیاردەیەکی داهێنراوی نوێی ساڵی ١٨٤٨نەبوو. هەڵم، کارەباو چنینی ئالی، لە ئەندازە بەدەر، شۆڕشگێڕگەلێکی زۆر ترسناکتربوون لە بەرێزان باربیس، راسبای و بلانکی، بەڵام ئەم

ئەتمۆسفێرەی تێدا دەژین، بە هێزی ٢٠٠٠٠باوەند فشار بۆ هەر یەکێك لە ئێمە دەهێنێ، ئایا هەست بەمە دەکەین؟نەخێر، وەك چۆن کۆمەڵگای ئۆرووپی، پێشی١٨٤٨هەستی نەکرد بەو کەشوهەوا شۆڕشگێرەی دەوری دابوو و لە هەموو لایەکەوە فشاری بۆ دەهێنا.

راستییەکی مەزن هەیە، تایبەتە بە سەدەی نۆزەهەممانەوە، واقیعێك، هیچ حیزبێك ناوێرێ لای لێ بگرێ. لە لایەکەوە، هێزی پیشەسازی و زانستی بێداربووەوە، لە هەموو سەردەمە کۆنەکانی مێژووی مرۆڤایەتی هەرگیز بە مێشکی هیچ کەسێك نەهاتبوو. لەلایەکی ترەوە، سیمای سەرەوژێربوونێك دەرکەوتووە، کە هەموو کارەساتە ناسراوەکانی مێژوو، لە دوا سەردەمی ئیمبراتۆرییەتی رۆمانییەکانەوە، تێدەپەڕێنێت.

لەم سەردەمەدا، وێدەچێ هەموو شتێك لە گەڵ دژەکەیدا بنووشتێتەوە. ئێمە دەبینین ئەو ماشینانە کە هێزێکی سەرسوڕهێنەریان هەیە بۆ کەمکردنەوەی ماوەی کاری ئینسان و بۆ ئەوەیە بە پیتتر بەکاربهێنرێت، بەڵام برسییەتی و لە پەلوپۆکەوتنیشیان بۆ خەڵك هێناوە. سەرچاوەی نوێی سامان، بە ڕێگای جادوگەرییەکی سەیر، دەبێت بە سەرچاوەی هەژاری. وا دێتە پێش چاو، وەك بڵێی، نرخی سەرکەوتنی تەکنیك، سەرەوژێربوونی ڕەوشتە. وا دەردەکەوێت، بە قەد ئەوەی مرۆڤایەتی، سرووشت دەخاتە ژێر رکێفی خۆی، یا دەبێ ببێ بە کویلەی کەسانی تر یا ڕێك بە کویلەی ئاستنزمییەکەی خۆی. تەنانەت وا دیارە، رۆشنایی بێ گەردی زانست، دەتوانێ تەنها بە سەر پشتخانی نەزانین بدرەوشێتەوە. هەموو دۆزینەوەو پێشکەتنمان بەرەو ئەو شوێنە دەمانبات، هێزە ماددییەکان، ژیانی هزری وەردەگرێت و ژیانی مرۆڤایەتی لایەنە



هزرییەکەی لەدەست دەدات، ئاستی بەرەو پلەی هێزێکی ماددی رووت و قوت نزم دەکاتەوە. ئەم ئەنتاگۆنیستە لە نێوان پیشەسازی و زانستی هاوچەرخ لە لایەك و هەژاری و وەرگەڕانی هاوچەرخ لە لایەکی دیکەوە، ئەم ئەنتاگۆنیستە لە نێوان هێزی بەرهەمهێنەرو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لەم سەردەمەدا، واقیعێکی هەستپێکراو، حەتمییە و هیچ جەدەلێکی تێدا نابی. هەندێ حزب هەن، لەمە وەرتەوەرت دەکەن و هەندێکی کەشیان دەیانەوێ لەم تەکنیکە هاوچەرخە رزگاری ببێ ، بۆ ئەوەی لە گرفتە هاوچەرخەکان رزگاری ببێ، و سێهەمەکەشیان وادەزانێ کە هەر دەبێ پێشکەوتنێکی وا گەورە لە پیشەسازی پێش بێ بۆ تەواو بوونی، بە هەمان ئەو گەورەییە پێویستی بە بەرەو کشانەوە هەیە لە سیاسەت. بەڵام ئێمە، لە لایەن خۆمانەوە وێڵ نابین لەوەی پەیوەستە بە سرووشتی ئەم ڕۆحە زیرەکە کە هەمیشە لە هەموو ئەم ناکۆکییانە دەردەکەوێت. ئێمە دەزانین کە هێزی کۆمەڵایەتی نوێ پێویستی بە هیچ نییە بۆ ئەوەی بە درووستی کارتێکردنی خۆی بکات، تەنها بۆ یەك شت نەبێ، ئەوەش پێویستی بە مرۆڤی نوێ هەیەو بێن بە وەستای، ئەوانەش کرێکارەکانن. ئەمانە لە داهێنانی ئەم چەرخە، وەك خودی ماشینەکانن. لە ناو ئەو دیاردانەدا کە هەرای ناوەتەوە لە ناو ریزی بۆرژوا، ئێروستۆکرات و پێغەمبەرانی بەرەودواکشانەوەی سەرشێواو، برادەری شرینمان رۆبین گودڤیلۆڤ دەناسین ، ئەم (ماولڤۆرف) کە زۆر بە پەلە چاڵ لە ژێر زەمین هەڵدەکەنێ و مین دانەری گەورە—شۆڕشە.

کرێکارە بەریتانییەکان، یەکەم لەدایکبووی پیشەسازی هاوچەرخن و هەڵبەت نابن بە دوا راپەڕیوو بۆ فریاکەوتنی ئەو شۆڕشە کۆمەڵایەتییە کە لەم

پیشەسازییە، سەرچاوە دەگرێ–ئەو شۆرشە کە واتاکەی، رزگاری خودی جینەکەیانە لە هەموو جیهان، و وەك دەسەلأتی سەرمایەو کویلایەتی کاری گرێگرتە، جیهانییە. من ئەوە دەزانم کە چینی کرێکاری بریتانی، لە ناوەڕاستی سەدەی رابردوو چ خەباتێکی قارەمانانەیان کردووە. خەباتێکە، بۆیە ناوداری دەرنەکرد، چونکە مێژوونووسە بۆرژواکان لە پەنادا هێشتیانەوەو بێدەنگیان لە ئاستیدا گرت.

لە ئەلمانیای سەدەی ناوەڕاستدا، دادگایەکی نهێنی هەبوو بە ناوی(دادگای فێم). ئەم دادگایە بۆ تۆڵەسەند لەسەر تاوانەکانی چینە دەسەلأتدارەکان دامەزراوە. گەر لە سەر دیواری مالێکدا، وێنەی خاچێکی سووری لە سەر ببینرابا، ئەوا خەلکەکە دەیزانی کە خاوەنی مالەکە لە لایەن(فێم)ەکانەوە سزادراوە. بەلأم ئێستا لە سەر هەموو مالەکانی ئۆروپا وێنەی خاچی سووری پڕ نهێنی کێشراوەو مێژوو بەخۆی دادوەرە، جێبەجێکەری سزاکە، پرۆلیتاریایە.

بە زمانی ئەنگلیزی لە **The People Paper** ، ژمارە٢٠٧، لە١٩/٤/١٨٥٦، بلأوکراوەتەوە

کارل مارکس/فریدریك ئەنگلس بەرگی١٢، لاپەڕەی٣–٤ بە زمانی ئەلمانی.



## بەشداری رەخنەگرتن لە ئابووری سیاسی*

**کارل مارکس**

من بەم شێوەی خوارەوە، باسی سیستێمی ئابووری بۆرژوازی دەکەم: سەرمایە، موڵکایەتی زەوی، کاری کرێگرتە، دەوڵەت، بازرگانی دەرەوە و بازاری جیهانی. لە سێ بابەتی یەکەم، تۆژینەوەی بارودۆخی ئابووری سێ چینە گەورەکە دەکەم کە کۆمەڵگای بۆرژوازی هاوچەرخ تێدا دابەش بووە، پەیوەندییە بەرامبەرکییەکانی سێ بابەتەکەی تریش لە بەرچاومان روون دەبنەوە. بەشی یەکەم :١/ کالأ، ٢/پوول، یا ئالۆگۆڕی سانا، ٣/ سەرمایە بە گشتی. دوو بەشی یەکەم، ناوەڕۆکی ئەم چاپە پێکدەهێنن. هەموو بابەتەکە بە شێوەی لێکۆڵینەوەی تایبەت لە بەر دەستدایە، و لە قۆناغی جیاوازو بە دابڕان بۆ ماوەیەکی درێژ، نووسراون، نەك لە بەر بلأوکردنەوە، بەڵکو لە پێناوی ئەوەی بە خۆم هەستم بە روونکردنەوەی مەسەلەکان بۆ خودی خۆم. پێداچوونەوەی ئەم لێکۆڵینەوانە لە داهاتوودا بە گوێرەی ئەو رێکخستنەی کە پێشتر ئاماژەم بۆ کرد، بەند دەبێ بە بارودۆخە دەرەکییەکانەوە.

من ئەو پێشەکییە گشتییەکە دەسڕمەوە(مەبەستی ئەو پێشەکییە تەواونەکراوەیە کە ئامادەی کردبوو بۆ کتێبێکی ئابووری گەورە) کە پێشتر هێڵە سەرەکییە گەورەکانیم دانابوو، چونکە پاش بیرکردنەوەیەکی زۆر، بڕیارم دا، کەوا هەر پەلەکردنێك لە دەرئەنجامەکان کە هێشتا دەبێ بسەلمێندرێن، لە

بەردەممدا ببن بە کۆسپ. ئەو خوێنەرەی بییەوێ بەگشتی دوابەدوای نووسینەکەم بێ، دەبێ نییەتی هەبێ بۆ هەڵکشان لە تایبەتەوە بۆ گشت. بەڵام وای دەبینم، باشتریکە هەندێ تێبینی لە بارەی بەرەوپێشچوونی لێکۆڵینەوە تایبەتییەکانم لە مەڕ ئابووری سیاسی پێشان بدەم.

رشتەکەم یاساناسی بوو، بەڵام من توێژینەوەیم نەکردووە، ئەوە نەبێ وەك بابەتێکی وابەست لە پاڵ فەلسەفەو مێژوو توێژینەوەم کردووە.لە ساڵی ١٨٤٢ و١٨٤٣سەرنووسەری (رۆژنامەی راین)، بۆ یەکەم جار بۆچوونی خۆم لە بارەی ئەوەی پێدەڵێن بەرژەوەندییە ماددییەکان، دەربڕم. ئەو مشتومڕانەی لە پەرلەمانی ناوچەی راین بەرێوەچوو لە بارەی مەسەلە بەستراوەکان بە داردزین و دابەشکردنی موڵکی زەوییەکان و ئەو مشتومڕە رەسمییانە کە بەرێز فۆن شابر دەستی پێ کرد—ئەو کاتە بەرپرسی یەکەمی ناوچەی راین بوو—لە دژی رۆژنامەی راین، لە بارەی بارودۆخی جووتیارەکانی ناوچەی موزیل، و لە دوواییدا ئەو گفتوگۆیانە لە بارەی ئازادی بازرگانی و باجی گومرگ، یەکەم پاڵپێوەنەر بوون بۆ دەستکردنم بە خوێندنەوەی مەسەلە ئابوورییەکان. لەولاوەوە، لەو کاتەی ویستی چاك((بۆ چوونە پێشەوە))بۆ چەندین بار پێشهات بۆ تێگەیشتن لە بابەتەکان، لە رۆژنامەی راین دەنگی سۆسیالیزم و کۆمونیزمی فەرەنسی بە رەنگێکی فەلسەفی لاواز بەرز بووەوەو من لە دژی ئەم هەرایە بووم، بەڵام هاوکات، لە مشتومڕێکمدا لەگەڵ( رۆژنامەی ئەلگماینە) کە لە ئۆگسبۆرك دەردەچێ، هەبوو، دانم بەوە نا کە ئەو زانیارییانەی تا ئێستا هەمە، رێگام پێنادەن، هیچ حوکمێك لە سەر ناوەڕۆکی خودی ئەو دوو هێڵە فەرەنسییە بدەم. بۆیە بەوپەڕی ئارەزووەوە هەوڵی سوودوەرگرتن لە وەهمی



بەرپرسەکانی (رۆژنامەی راین) دا کە بە رێگای وەرگرتنی هەڵویستێکی هێمنانەتر، ئەو بڕیارە کە درابوو بۆ هەڵواسینی رۆژنامەکە، لایببەن، بۆ ئەوەی منیش لە شانۆی کۆمەڵایەتی بکشێمەوەو بۆ هۆڵی زانکۆ بگەڕێمەوە.

یەکەم کار کە دەستم پێکرد بۆ ئەوە بوو، چارەسەری ئەو گومانە بکەم کە هێرشیان بۆ دەبردم، ئەوەش شیتەڵکردنەوەیەکی رەخنەگرانە بۆ (فەلسەفەی ماف)ی هیگل بوو. پێشەکی ئەم کارە لە ساڵە١٨٤٤لە(ساڵنامەی ئەلمانی—فەرەنسی)کە لە پاریس دەردەچوو، بڵاوکرایەوە. لێکۆڵینەوەکان گەیاندیانم بەو ئەنجامە، کە حاڵی پەیوەندییە یاساییەکان، رێك وەك حاڵی شێوەکانی دەوڵەتە، ناکرێ لێی تێ بگەین، نە بەحوکمی خودی خۆی و نەیش بە حوکمی ئەوەی ناوی لێنراوە پەرەسەندنی گشتی رۆحی بەشەریی، بەڵکو بە پێچەوانەوەیە، رەگەکانی شۆڕ دەبێ بۆ ناو پەیوەندیە ماددیەکانی ژیان کە هیگل هەموویان ناو دەنێ ((کۆمەڵگای مەدەنی))، هەر وەکو نووسەرە ئەنگلیز وفەرەنسییەکان دەیکەن، و دەبێ بگەڕێین بۆ ئەنەتۆمی کۆمەڵگای مەدەنی لە ناو ئابووری سیاسی. ئەو توێژینەوە ئابووری سیاسییە کە لە پاریس دەستم پێکرد، لە برۆکسل، کە بارم بۆ کرد، درێژەم پێدا، چونکە لە سەر فەرمانی بەرێز غیزۆ لە پاریس دوورخرامەوە. ئەو ئەنجامە گشتییە کە پێی گەیشتم و لە دوواییدا بوو بە پەتی رێپیشاندەر لە لێکۆڵینەوە داهاتووەکانم، دەکرێ بەم شێوەی خوارەوە، بە کورتی دایانرێژم: لە نێو مرۆڤەکاندا، لە کاتی بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتی ژیانیان، پەیوەندییەکی دیاریکراوی پێویست، سەربەخۆ لە ئیرادەیان دادەمەزرێ، ئەوەش پەیوەندی بەرهەمهێنانە کە هاوتای پلەیەکی دیاریکراو لە پەرەسەندنی هێزە بەرهەمهێنەرە ماددیەکانە. کۆی ئەم

پەیوەندی بەرهەمهێنانە، دامەزراوی ئابووری کۆمەڵگا پێکدەهێنێ، واتە ئەو بنەما واقیعییە کە لە سەریدا، سەرخانی یاسایی و سیاسی دادەمەزرێ و شێوەی دیاریکراو لە هوشیاری کۆمەڵایەتی هاوتای دەبێ.

شێوەی بەرهەمهێنانی ژیانی ماددی، پێشمەرجی کارلێکردنی(تفاعل) ژیانی کۆمەڵایەتی،سیاسی و بیرمەندی دەکا بە شێوەیەکی گشتی. تێگەیشتن، بڕێوی خەڵك، دیاری ناکات، بەڵکو بە پێچەوانەوەیە، بڕێوی کۆمەڵایەتیان هوشیاریان دیاری دەکات. کاتێ هێزی کۆمەڵایەتی بەرهەمهێنانی ماددی دەگات بە پلەیەکی دیاریکراو لە گەشەکردن، لە گەڵ پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان وپەیوەندی موڵکایەتی دەبێتە ناکۆکیان. –ئەمە تەنها دەربڕینی یاساییە بۆ ئەوە– کە تا ئەو وەختە لە دووتۆیدا گەشەی دەکرد. پاش ئەوەی ئەم پەیوەندییانە پێکهاتگەلێك بوون بۆ پەرەسەندنی هێزە کۆمەڵایەتییەکان، دەبن بە کۆت بۆ ئەم هێزانە. ئەو کات دەرگای سەردەمی شۆڕشی کۆمەڵایەتی دەکرێتەوە. لە گەڵ گۆڕینی بنچینەی ئابووری، بەم یا ئەو خێرایی، سەراوێژبوون(انقلاب)لە هەموو سەرخانی زلهێز روودەدات. لە کاتی توێژینەوەی ئەم سەراوێژبوونە، دەبێ بەردەوام جیاوازی بکرێ لە نێوان وەرچەرخانی ماددی بۆ مەرجەکانی بەرهەمهێنانی ئابووری–ئەم وەرچەرخانە بەوردی، زانستی سرووشتی دیاری دەکات–ولە نێوان شێوە یاسایی، سیاسی، ئاینی، هونەری و فەلسەفییەکان، بە کورتییەکەی، شێوە ئیدۆلۆژییەکان کە مرۆڤ لەم ململانییەدا هوشیار دەبن و بۆ چارەسەرکردنی، خەبات دەکەن. هەر چۆن ناکرێ حوکم لە سەر تاکێك بدەین بەگوێرەی ئەو فکرەیە کە خۆی لە سەر خۆی هەیەتی، ئەوایش ناکرێ حوکم بەسەر سەردمی وەرچەرخانێکی ئەم



چەشنە، بە گوێرەی هوشیارییەکەی بدەین، بەڵکو بەپێچەوانەوە، دەبێ راڤەی ئەم هوشیارییە بە ناکۆکییەکانی ژیان بکەین و بەو ململانییەی هەیە لە نێوان هێزی بەرهەمهێنەری کۆمەڵگاو پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان. هیچ پێکهاتێکی کۆمەڵایەتی نامرێ پێش پەرەسەندنی هەموو هێزە بەرهەمهێنەرەکان کە بە گوێرەی بواردان شوێنی بۆ دەکاتەوە، وهەرگیز هیچ پەیوەندییەکی بەرهەمهێنەرانەی نوێی باڵاتر دەرناکەوێت، پێش پێگەیشتنی مەرجە مەتریالیستییەکەی لە ناو دڵی خودی کۆمەڵگای کۆن . بۆیە مرۆڤایەتی هەرگیز هیچ مەسەلەیەك لە پێش خۆی دانانێت، تەنها ئەوانە نەبێت کە پێدەکرێ چارەسەریان بکات، ئەوەش هەمیشە رووندەبێتەوە، کاتێ بە بەردەوام بۆی دەگەڕێین، کە خودی مەسەلەکە وەدیار ناکەوێ، تەنها لەو کاتە مەرجە ماددییەکان بۆ چارەسەرکردنی بوونی هەیە، یا، لەلانی کەمەوە، بەرەو پێکهاتنە.

تەرزەکانی بەرهەمهێنانی ئاسیایی، ئەنتیك، دەرەبەگایەتی وبۆرژوازی هاوچەرخ وێنەیان بە هێڵە گەورەکانیان راکێشراون ودەتوانین بە سەردەمانی هەڵکشان لە پێکهاتی کۆمەڵ – ئابووری لەقەڵەم بدەین. پەیوەندی بەرهەمهێنانی بۆرژوازی دوا شێوەی ئەنتاگۆنیستە لە پرۆسێسی بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتی، ئەنتاگۆنیست نا بە واتە تاکییەکەی، بەڵکو بەو واتایە کەلە مەرجە کۆمەڵایەتییەکانی ژیانی تاکەکان گەشە دەکات، بەڵام هێزە بەرهەمهێنەرە گەشەسەندووەکانی ناو دڵی کۆمەڵگای بۆرژوازی، لە هەمان کات مەرجە ماددیەکان درووست دەکات بۆ چارەسەرکردنی ئەم ئەنتاگۆنیستییە. لەگەڵ ئەم

فۆرماتسیونە(پێکهات–تشکیلە)کۆمەڵایەتییە، پێش مێژووی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی کۆتایی پێدێت.

فریدریك ئەنگلس کە لە تەکیدا بە بەردەوام بە ڕێگای نامە، بیروڕام دەگۆڕییەوە، لەو کاتەی کە تێبینییە بلیەمەتەکانی لە ڕەخنەگرتن لە کاتەگۆری ئابووری لە گۆڤاری(ساڵنامەی ئەلمانی–فەرەنسی) دەرکەوت، بە شێوەیەکی تر گەیشت بە هەمان ئەو سەرئەنجامە کە من پێ گەیشتم(بەراوردی کتێبی ((بارودۆخی چینی کرێکاری لە ئەنگلتەرا)). کاتێ ئەویش لە بەهاری ١٨٤٥ برۆکسل نیشتەجێ بوو، بڕیارماندا، پێکەوە بۆچوونەکانمان لە دژی تێڕوانینە ئیدۆلۆژییەکانی فەلسەفەی ئەلمانی دابڕێژین وبە کردەوە کۆتایی بە وویژدانە فەلسەفییەکەی جارانمان بهێنین. ئەم نیازە بە شێوەی ڕەخنەگرتن لەو فەلسەفەیە کە لە پاش فەلسەفەکەی هیگل دەرچوو(ئیدۆلۆژی ئەلمانی)، جێبەجێ کرد. دەسنووسەکە–پێکهاتووە لە دوو بەرگی ئەستوور–دەمێك بوو گەیشتبوو بە شوێنی چاپکردن لە ویستەڤال وپێیان ڕاگەیاندین کە گۆڕانی بارودۆخە وایکرد، قەت چاپ نەکرێ. لەبەر ئەوەی ئێمە بە ئامانجە سەرەکییەکەمان گەیشتین–ڕوونکردنەوەی مەسەلەکان بۆ خۆمان – دەسنووسەکەمان بەوپەڕی حەسانەوە دامانە بەر ڕەخنەی مشکەکان. لەو توێژینە جۆراوجۆرانە کە تێیاندا بۆچوونەکانمان لەم یا ئەو بارەوە، لەو کاتە بە جەماوەر پێشاندەدا، تەنها بەس دەکەم بەناوهێنانی ((بەیاننامەی حیزبی شیوعی)) کە هەردووکمان نووسییوومانە و((ووتەیەك لە بارەی ئازادی بازرگانی)) کە من بلاوم کردەوە. یەکەم جار لە((هەژاری فەلسەفە))کە لە١٨٤٧



بلاوکرایەوە، و دژی برۆدۆن بوو، پێکڤە، بە شێوەیەکی زانستیانە خاڵە جوێکەرەکانی بیروڕامان، گەر چی تەنها بە شێوەی حیوار بوو.

لە پاش شۆڕشی شوبات، وبەو هۆیەوە، بە زەبر لە بەلژیکا دووریانخستمەوەو ڕێگایان نەدا بە چاپکردنی بەرهەمەکەم((کاری گرێگرتە))کە بە زمانی ئەلمانی نووسیبووم و چەندین ووتاری لە گەلدا بوو کە لە کۆمەڵەی کرێکارانی ئەلمان لە برۆکسل پێشکەشم کردن.

دەرچوونی(ڕۆژنامەی ڕاین نوێ)لە ساڵی١٨٤٨و١٨٤٩وئەو ڕووداوانەی بەدواوەوەی هاتن، بوون بە هۆی دابڕان لە لێکۆڵینەوە ئابوورییەکانم و نەیشم توانی دەستی پێ بکەمەوە، لە ١٨٥٠لە لەندەن نەبێ. ئەو بابەتە زۆرە لە بارەی مێژووی ئابووری سیاسی کە لە مۆزەخانەی بەریتانیا کۆکرابووەوە و لە بەر ئەوەی لەندەن ناوەندی چاودێری گونجاوە بۆ توێژینەوەی کۆمەڵگای بۆرژوازی، و لە دواییشدا، ئەو قۆناغە پەرەسەندنە نوێیەی ئەم کۆمەڵگایە چووەتە ناوی، وەك پێدەچێ، هەر لە دۆزینەوەی ئاڵتون لە کالیفۆرنیا و ئوستراليا، هەموو ئەمانە پاڵیان پێوە نام، ڕێك لە دەسپێکەوە، بە چاوێکی ڕەخنەگرانەوە دەست بە کار بکەمەوەو چارەسەری ئەم ماددە نوێیە بکەم. ئەم لێکۆڵینەوەیە، هەر لە خۆیەوە، بەرەو مەسەلەگەلێ بردیانم، کە لەیەکەم تێڕوانین وا دەردەکەوێت، هەرگیز پەیوەندیان بە بابەتەکەوە نییە. بەلام ناچار بووم تا ئەم یا ئەو ڕادە، بۆ ماوەیەکی زۆر لێیان دوور بکەومەوە. کەچی ئەو کاتە زۆرەی هەموو کەم بووەوە، بە تایبەتی بە هۆی ئەوپەڕی ناچاربوونم بۆ کارکردن لە پێناوی نانی ڕۆژانەم. پاشان ئەو هاوکارییەم–کە ئێستا٨ساڵ بە سەری تێدەپەڕێ– لە ڕۆژنامەی نیویۆرگ دیلی–یەکەم ڕۆژنامەی ئەنگلیزی–

ئەمریکییە(بەدەگمەن راپۆرتی رۆژنامەگەرییانە دەنووسم) چەندین جار، ناچاربووم لە خوێندنەوە زانستییەکانم گەڕێم. بەڵام ووتارەکانی لە باری رووداوە ئابوورییە لە بەرچاوەکانی ئەنگلتەرا و لە کیشوەرکە، کاتی زۆری لێ گرتم لە پێناوی رۆژنامەکە، تا ئەو رادەیە کە ناچار بووم ئاگاداری ئەو وەردەکارییە عەمەلیانە بم کە لە دەرەوەی سنووری زانستی ئابووری سیاسیەوە هەن.

مەبەست لەم تێبینییانە لە بارەی چوونەپێشەوەی لێکۆڵینەوەکانم لە بواری ئابووری سیاسی ئەوەیە، بیسەلمێنم کە تێڕوانینەکانم، هەر چییەك لە بارەیانەوە بڵێن، وچەند هاوتاییان کەمتر بێت لە گەڵ وەهمە خۆپەرەستەکانی چینە دەسەڵاتدارەکان، سەرئەنجامی لێکۆڵینەوەی وردو درێژخایەنن، بەڵام لە پێش دەرگای زانست، وەك پێش دەرگای دۆزەخە، دەبێ ئەم داخوازییە دابنرێت:

لێرەدا، دەبێ گیان بە هێز بێ،
لێرەدا دەبێ ترس ئامۆژکار نەبێ.
(دانتی)

لەندەن، یەنوەر١٨٥٩
لە بەرگی١٣،لاپەڕەی٧-١١
*پێشەکی نووسینەکەیە



## خۆپرچەککردن و سەرمایەداری
## لینین

بەریتانیا، یەکێکە لە دەوڵەمەندترین وەڵاتانی جیهان و لە هەموویان زیاتر ئازاد و پێشکەوتووترە. دەمێکە، پەتای خۆپرچەککردن((کۆمەڵگا)) وحکومەتی بەریتانی گرتووەتەوەو حاڵیان رێك وەك حاڵی کۆمەڵگا و حکومەتی فەرەنسا و ئەلمانیایە...هتد

ئەوەتە رۆژنامەوانی بەریتانی-و بەتایبەتی رۆژنامە کرێکارییەکان-ئەم رۆژانە سەرئەنجامی وا بڵاودەکەنەوە کە جێی سەرەنجەو((میکانیزمی))خۆپرچەکردن سەرمایەداری فێڵباز پیشاند دەدات. خۆپرچەککردنی هێزی دەریایی بەریتانی بە شێوەیەکی تایبەت، گەورەیە. شەرکەتەکانی درووستکردنی پاپۆڕی بەریتانی (ویکەرز، ئارمسترۆنگ، براون...هتد)لە جیهاندا ناوبانگیان هەیە. بەریتانیا و وەڵاتەکانی، دی سەدان و هەزاران ملیون رۆبڵ خەرج دەکەن بۆ خۆئامادەکردن بۆ جەنگ-زۆر ئاساییە، هەموو ئەو خۆپرچەککردنە بە تایبەتی لە پێناوی ئاشتی و پاراستنی کلتور و لە پێناوی نیشتیمان و شارستانییەتەو هتد...-.

ئێمە دەبینین ئەدمیراڵ و بەناوبانگترین کەسایەتی دەوڵەتی بەریتانی لە هەردوو حزب: حزبی پارێزەران و حزبی لیبراڵەکان، کە وەك بەشدار و بەرێوەبەرانی دەزگاکانی پاپۆڕ، بارود، دینامیت و بۆمبهاوێژ درووستکردنن و ئەوانی تریش

هەروا. بارانی بە بەرەکەت، راستەوخۆ بۆ گیرفانی بۆرژوا بەڕێزەکان دەبارێت، ئەمانە چەتەی جیهانی یەکگرتوو پێکدەهێنن و گەلان هاندەدەن بۆ کێبرکێکردن لە بواری خۆچەکدارکردن و پێستی ئەو گەلە گوێڕایەڵ، خۆشباوەڕ و گێل و ئەحماقانە وەك مەڕ لێدەکەنەوە !

خۆچەکدارکردن، بە مەسەلەی نەتەوەیی و نیشتیمانی دادەنێن و وایشی بۆ دەچن، هەموویان، نهێنییەکە، بە شاراوەیی بپارێزن، بەڵام کارگا و شەرکەتەکانی پاپۆڕ، بۆمبهاوێژ، دینامیت و تفەنگ دروستکردن، دەزگای جیهانی پێکدەهێنن، سەرمایەدارانی وەڵاتان، قۆڵ بە قۆڵی یەکتر، فێڵ، دزی لە ((جەماوەر))ی وەڵاتەکان دەکەن، ئەوانە پاپۆڕ یا بۆمبهاوێژ بۆ بریتانیا دروستدەکەن لە دژی ئیتالیا، و بۆ ئیتالیا لە دژی بەریتانیا بە هەمان شێوە، دروستدەکەن.

<u>ئەوەتە ئالییەتی سەرمایەداری مەکرباز!شارستانی، رێکخستن، رۆشنبیری و ئاشتی– و راورووتکردنی ملیونان رۆبلّ لە لایەن خاوەن کار و قولّبڕەکان، خاوەنی سەرمایەی دروستکردنی پاپۆڕ و دینامیت و ئەوانی تر!</u>

بەریتانیا سەر بە ویفاقی سێ قۆڵییە لە دژی هاوپەیمانانی سێ قۆڵ و ئیتالیا یەکێکە لەو دەوڵەتانە تێدا ئەندامە. شەرکەتی ویکەرزی بەناوبانگ (بەریتانی) چەندین لقی لە ئیتالیا هەیە. بەشداربوانی ئەم شەرکەتەو بەرێوەبەرەکانی(بەرێگای رۆژنامە کرێگرتەکان و((کەسایەتییە)) پەرلەمانتاریستە کرێگرتەکان لە حزبی پارێزەران و لیبراڵەکان، جۆریەك) بەریتانیا لە دژی ئیتالیاو بە پێچەوانەشەوە، هاندەدەن. لە هەمان کاتدا



قازانجی خۆیان لە کرێکارانی بەریتانیا و ئیتالیا وەك یەك وەردەگرن و لێرەو لە وێ گەلّ ڕاوڕوت دەکەن.

هەموو وەزیرو ئەندامانی شوورای گشتی پارێزەران و لیبراڵەکان– بەشدارن لەو شەرکەتانە. کوڕی وەزیری((مەزن))غلادیستۆن، بەڕێوەبەری شەرکەتی (ئەرمسترۆنگ)ە و ئەدمیراڵی دەریا بیکۆن،بەناوبانگترین دەریاناس وگەورەترین کارمەندە لە(بەرژەوەندی))لە بەریتانیا دەگوێزیتەوە بۆ کارگەی بۆمبهاوێژی قورس لە کوفنتری و موچەکەی دەگاتە٧٠٠٠جونەی سترلینی، کەچی سەرۆك وەزیری بەریتانیا ٥٠٠٠ جونەی وەردەگرێ. هەڵبەت، هەمان ئەم شتە لە هەموو وەڵاتە سەرمایەدارییەکان روودەدا. حکومەتەکان،پاسەوانی چینی سەرمایەدارەکانن، ئەوانیش موچەیەکی زۆر باش وەردەگرن. هەروا خودی پاسەوانەکانیش خاوەنی بەشن. مەڕەکانیش، لە ناوەڕاستی هاتوهاواری ووتار خوێندنەوەکان لە بارەی ((نیشتیمانپەروەری))، پێکەوە توکیان هەڵدەپاچن...

لە ٢١ئایاری١٩١٣،لە پراڤدا، ژمارە١١٥بلاّوکراوەتەوە

٧بەرگی٢٣،لاپەڕەی١٧٥–١٧٦

**چەند بابەت و راپۆرتێك لە بارەی دیموكراتی بۆرژوازی و دیكتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا(٤ئازار-مارس)لە كۆنگرەی یەكەمی كۆمونیستی ئینترناسیونال كە لە ٢-/ئازار/١٩١٩دامەزرا**

لێنین

١-گەشەكردنی بزووتنەوەی شۆرشكێری پرۆلیتاریا لە هەموو ولاّتەكان، خۆشكردنی ئاگری هەولّی بیّ سوود لە لای بۆرژوا و نەوكەرەكانی لە رێكخستنە كرێكارییەكان، لە پێناو دروستكردنی بیانووی فكری وسیاسییە بۆ بەرگری لە دەسترۆیی چەوسێنەران. لەو بیانووانە، مەحكومكردنی دیكتاتۆرییەت و پشتگیری لە دیموكراتییەت، شوێنێكی تایبەتی هەیە. نادرووستی و ریاكاری ئەم بیانووانە كە بە هەزار شێوەو رەنگ لە رۆژنامەگەری بۆرژوازی دووبارە دەبنەوە، و لە كۆنگرە زەردەكەیان لە بیرن لە مانگی فبرایەر١٩١٩، بە تەواوی



روونن بۆ هەر كەسێك بییەویّ دەستپاك بیّ بۆ پرەنسیپە سەرەتاییەكانی سۆسیالیزم.

٢- لە پێشی پێشەوە، خاوەنی ئەم بیانووانە، حنجەتی تێگەیشتنی ((دیموكراسی بە شێوەیەكی گشتی))و((دیكتاتۆرییەت، بە شێوەیەكی گشتی)) دەهێننەوە، بە بیّ ئەوەی پێمان بلّێن، مەبەستیان كام چینە. پیشاندانی ئەم مەسەلەیە بەو شێوەیە، لە تێروانینی هەموو نەتەوەوە، وەك خۆیان دەلّێن، لە دەرەوەو لە سەرووی چینەكانە، گالّتەجارییەكی روونە بە بنەمای بیری سۆسیالیستی و رێك بە بۆچوونی خەباتی چینایەتی، ئەو سۆسیالیستانە كە چوونە پالّی بۆرژوازی بە سەرزارەكی دانی پێدا دەنێن، بەلاّم لە كردەوەدا لە بیریان دەچیّ. چونكە ئەوەی لە هەموو وەلاّتە سەرمایەدارییە شارستانییەكان پێكهاتووە،((دیموكراسی بە شێوەی گشتی))نییە، بەلّكو دیموكراسی بۆرژوازییە، ومەبەستەكەیان((دیكتاتۆرییەتی بە شێوەیەكی گشتی))نییە،بەلّكو دیكتاتۆرییەتی چینی چەوساوەیە، واتە پرۆلیتاریا، لە سەر چەوسێنەران، واتە بۆرژوازییەكان، لە پێناوی سەركەوتن بە سەر ئەو بەرگرییە كە چەوسێنەران بۆ دیفاع لە دەسەلاّتەكەیان دەیكەن.

٣/ مێژوو ئەوەمان فێر دەكات كە هیچ چینێكی چەوساوە نییە، رۆژێك بە دەسەلاّت گەیشتووە یا توانیویەتی پێی بگات، بیّ ئەوەی بە قۆناغێكی دیكتاتۆری تێپەرِ نەبیّ، واتە قۆناغی وەدەستهێنانی دەسەلاّتی سیاسی و بەزەبروزەنگ لە ناوبردنی زۆرترین رووی بەرگری توندو بیّ سەرئەنجام، ئەو بەرگرییە كە سلّ ناكات لە ئەنجامدانی گشت تاوانێك، كە چەوسێنەران هەمیشە پێی هەستاون. ئەو بۆرژواییە كە ئەمرۆ ئەو سۆسیالیستانەی بەرگری لیّ دەكەن

ولە دژی ((دیکتاتۆرییەت بە شێوەیەکی گشتی)) رادەپەڕن وباسی(( دیموکراتییەت بە شێوەیەکی گشتی)) دەکەن، لە وەلاتە پێشکەوتووەکان بە رێگای کۆمەڵێ راپەڕین و جەنگی ناوخۆیەوە دەسەلاتیان گرتە دەستکەوت، بە زەبروزەنگ، پاشا، دەرەبەگ و خاوەن کۆیلەکان پانکردەوە و هەوڵەکانیان بۆ گەڕانەوە لەناوبرد. هەزاران و ملیونان کەڕەت، سۆسیالیستەکان لە هەموو وەلاتەکان پۆی چینایەتی ئەو شۆرشە بۆرژوازییانە، ئەو دیکتاتۆرییەتە بۆرژوازییە لە کتێب و ناملیکەکانیان، لە بڕیارەکانی کۆنگرەکانیان، لە خیتابە هاندەرەکانیان بۆ گەل روونکردەوە. بۆیە ئەو بەرگرییەی ئەمڕۆ دەکرێ لە دیموکراسی بۆرژوازی بە ووتارخوێندنەوە لە بارەی((دیموکراسی بەگشتی)) و نەفرەتکردن لە دیکتاتۆری پرۆلیتاری بە قیژە وهاوار لە دژی((دیکتاتۆرییەت بەگشتی))، مەبەستیان خیانەتکردنە لە سۆسیالیزم و بە کردەوە دەگوێزانەوە بۆ بەرەی بۆرژوازی و مافی پرۆلیتاریا لە هەستانی بە شۆرشی پرۆلیتاری خۆی بە ڕەوا نازانن و بەرگری لە ریفۆرمیزمی بۆرژوازی دەکەن لەو چرکەساتەی کە ئەو ریفرمکردنە لە جیهان ئیفلاسی کرد و تێدا جەنگ، بارودۆخی شۆرشگێڕانەی هێنایە نەشونەماکردن.

٤- هەموو سۆسیالیستەکان، پۆی چینایەتی شارستانییەتی بۆرژوازی و دیموکراتی بۆرژوازی و پەرلەمانی بۆرژوازییان روونکردەوە. ئەو بیرۆکەیەی مارکس وئەنگلسیان دەربڕی کە بەوپەڕی وردبینی زانستیانەوە گوتیان، دیموکراسی ترین کۆماری بۆرژوازی شتێکی تر نییە غەیری ئامرازێك بۆ سەرکوتکردنی چینی کرێکار لە لایەن بۆرژوازییەوە، بۆ سەرکوتکردنی هەموو زەحمەتکێشان لە لایەن مشتێك لە سەرمایەدەرانەوە. هەرگیز تاقە



شۆرشگێڕێکیش نییە، تاقە مارکسییەك نییە لە نێو ئەوانەی ئەمڕۆ دەنگی خۆیان لە دژی دیکتاتۆرییەت و لە پێناوی دیموکراسی هەڵدەبڕن و لە بەردەم کرێکاراندا سوێندی گەورە نەخون کە لە پێناوی سۆسیالیزمدا، دان بەم راستییە سەرەتاییە دەنێن، بەلام ئێستا، پرۆلیتاریای شۆرشگێڕ دەستی بە گەشەو بزووتنەوەی بە ئامانج کردووە بۆ خاپوورکردنی ئەم ئامرازی چەوسانەوەیەو دەستکەوتنی دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا، بەلام خیانەتکارانی سۆسیالیزم، مەسەلەکان وا پیشان دەدەن، وەك بلێی بۆرژوا((دیموکراسی تۆخ)) بە کارگەرانیان داوە، لە بەرگری وازیهێناوەو ئامادەیە سەر بۆ زۆربەی کارگەران بچەمێنێ. لە هیچ کۆمارێکی بۆرژوازی، هیچ ئامێرێکی دەوڵەتی بۆ سەرکوتکردنی کار لە لایەن سەرمایییەوە نەبووە.

٥/ کۆمونەی پاریس کە بە زارەکی هەموو ئەوانەی دەیانەوێ خۆیان بە سۆسیالیست پیشانبدەن، بەرزرادەگرن، چونکە دەزانن، جەماوەری کرێکاران سۆزێکی گەرم و راستگۆیانەیان بۆ هەیە، زۆر بە روونی خەسلەتی(نسبییەت)ی مێژوویی وبەها سنووردارەکەی پەرلەمان و دیموکراتی بۆرژوازی پیشاندا. هەردووکیان تا رادەیەکی زۆر دوو دەزگای پێشەکەوتون لە بەراورد لە گەڵ دەزگاکانی سەدەی ناوەڕاست، بەلام پێویستیان بە گۆڕانکاری بنەڕەتی هەیە لە سەردەمی شۆرشی پرۆلیتاریا. مارکس کە باشترین کەسە گرنگی مێژوویی کۆمونەی هەڵسەنگاند، لە کاتی تۆێژینەوەی، پۆی بەرخوری دیموکراتی و پەرلەمانی بۆرژوای سەلماند، کە چینە چەوساوەکان، هەر چەند ساڵ جارێ مافی بڕیاردانی ئەمە بدەن: کامە نوێنەری چینە موڵکدارەکان((نوێنەرو سەرکوتکەری))گەل بکا لە ناو پەرلەمان.

لەم ماوەیەدا، بزووتنەوەی سۆفێتی لە خۆدا، هەموو جیهان دەگرێتەوەو لە بەرچاوی هەمووان، درێژە بە کاری کۆمونە دەدا، رێك لەم کاتەدا، خیانەتکارانی سۆسیالیزم، ئەزموون و وانە هەستپێکراوەکانی کۆمونەی پاریسیان لە یاد دەچێ و دووبارەی ووتە کۆن و سووکەکان دەکەنەوە لە بارەی((دیموکراسی بە شێوەی گشتی)). کۆمونە دەزگایەکی پەرلەمانی نەبوو.

٦/ هەروا، گرنگی کۆمونە لەوەدا بوو، کە هەوڵیدا هەموو ئامێری دەوڵەتی بۆرژوازی–ئیداری، دادپەروەری، سەربازی، پۆلیسی– بڕۆخێنێ ولەناو ببات، رێکخستنێکی جەماوەری بۆ کرێکاران خاوەن بەرێوەبەردنی خۆیی، کە لێترازاندنی دەسەڵاتی تەشریعی و تەنفیزی نەناسێ، لە شوێنیان دابنێ. ئەو ئامرازە دەوڵەتییانە هێشتا هەموو کۆمارە دیموکراتییە بۆرژوا نوییەکان، پاراستووە، بە کۆماری ئەلمانیاوە کە خیانەتکاران بە سۆسیالیزم، بۆ گاڵتەجاڕی بە راستییەکان، ناویان لێ ناوە پرۆلیتاری. و هەروا سەر لە نوێ بەو پەڕی روونییەوە دەسەلمێندرێت، کە هاوار لە پێناوی(دیموکراسی بە شێوەیەکی گشتی))لەراستیدا تەنها دیفاعە لە بۆرژوازی و ئیمتیازە بەرخورییەکەیەتی.

٧/دەکرێ((ئازادی کۆبوونەوە))وەك نموونەیەك وەربگرین بۆ داخوازی ((دیموکراسی تۆخ)). هەر کرێکارێکی هوشیار پەیوەندی بە چینەکەیەوە نەپچراندبێ، یەکسەر تێدەگات لەوەی کە بەڵێنی چەوسێنەران بە ئازادی کۆبوونەوە لەو ماوە و بارودۆخە کە بەرگری لە روخاندن و ئیمتیازاتیان دەکەن، سەخافەتە. کاتێ بۆرژوازی شۆرشگێڕ بوو، نە لە ئەنگلتەرا ساڵی١٦٤٩و نە لە فەرەنسا ساڵی١٧٩٣هەرگیز ((ئازادی کۆبوونەوە))یان نەدا بە پاشاو



ئەشرافەکان کە پەنایان بۆ لەشکرە دەرەکییەکان دەبرد و((کۆدەبوونەوە)) بەمەبەستی رێکخستنی گەڕانەوەیان. گەر بۆرژوازی ئێستا، کە دەمێکە بووە بە کۆنەپەرەست، داوا لە پرۆلیتاریا بکا، پێشوەخت زامنی((ئازادی کۆبوونە))بۆ بەرخوران بکا، بەبێ بایەخدان بۆ ئەو بەرگرییەی کە ئەو سەرمایەدارانە پێهەڵدەستن بەڕووی دەستگرتن بەسەر موڵکەکانیان، ئەوا کرێکاران هیچیان بۆ نامینێتەوە، غەیری پێکەنین و گاڵتەجاڕی بە رێکاری بۆرژواکان. لە لایەکی دیکەوە، کرێکاران زۆر باش دەزانن کە((ئازادی کۆبوونە))تەنانەت لە باشترین کۆماری بۆرژوازی دیموکراسی، دەربڕینێکی بۆش و بێ مانایە، چونکە دەوڵەمەندەکان باشترین خانووی تایبەت و گشتیان لە خزمەتیاندایەو ئەوەندەش کاتی پێویستیان هەیە بۆ کۆبوونەوەکردن، هەروا پاراستنی ئەو کۆبوونەوانە لەلایەن ئامێری دەسەڵاتی بۆرژوازی، مسۆگەر کراوە. بەڵام پرۆلیتاری شار و لادێیەکان و جووتیارە هەژارەکان، واتە زۆربەی دانیشتوان، نە یەکەمەکەیان هەیە و نە دووهەم و نە سێهەمەکەش. مادام بارودۆخەکە وایە،((یەکسانی))، واتە((دیموکراسی تۆخ))تەنها وەك فێڵکردن دەمینێتەوە. بۆ ئەوەی یەکسانی حەقیقیمان دەست بکەوێ، بۆ ئەوەی دیموکراسی بەکردەوە بۆ کارگەران جێبەجێ ببێت، دەبێ یەکەم جار هەموو خانووە گشتییەکان و ماڵە تایبەتییەکان لە بەرخۆران وەربگرینەوە، دەبێ یەکەم جار کات بە کارگەران بدرێت، دەبێ کۆبوونەوەکانیان لەلایەن کرێکارە چەکدارەکان بپارێزرێن، نەك لەلایەن ئەشراف یا ئەفسەرە سەرمایەدارەکان لە گەڵ سەربازە شێتە چەوساوەکان.

تەنها پاش ئەم گۆرانکارییە دەکرێ باس لە مەڕ ئازادی کۆبونەوەکان و یەکسانی بکەین، بێ ئەوەی گاڵتەجاڕی بە کرێکاران و زەحمەتکێشان و هەژارەکان بکرێ. بەڵام کێ دەتوانێ ئەم گۆڕنکارییە جێبەجێ بکات، گەر پێشڕەوی زەحمەتکێشان، پڕۆلیتاریا نەبێ، کە بەرخۆران، بۆرژواکان دەروخێنن.

٨/((ئازادی رۆژنامەگەری))یش یەکێکە لە دروشمە سەرەکییەکانی(( دیموکراسی تۆخ))ە. کرێکاران لەمەش تێدەگەن–هەموو سۆسیالیستەکانی جیهان ملیونان جار دانیان پێ نا–کە ئەم ئازادییە، تەنها فێڵکردنە، تا سەرمایەداران باشترین چاپخانەو گەرەترین ئەمباری پەڕە لە خزمەتیان بێ، تا دەسەڵاتی سەرمایە بە سەر رۆژنامەگەری هەبێ، ئەم دەسەڵاتە روونترو باشتر و دەمشڕی دیاردەکەوێت، بە قەد ئەوەی سیستێمی دیموکراسی و کۆماری گەشەسەندووتر بێ، وەك لە ئەمریکا بۆ نموونە. بۆ ئەوەی یەکسانی و دیموکراسی حەقیقی بۆ زەحمەتکێشان، کرێکاران و هەژاران دەست بکەوێ، دەبێ یەکەم جار، توانای کڕینی بنکەی چاپەمەنی و بەرتیلدان بە رۆژنامەکان لێیان وەربگرینەوە، بۆ ئەمە دەبێ دەسەڵاتی سەرمایە بکوتین، بەرخۆران بڕوخێنین و بەرگریان سەرکوت بکەین. سەرمایەداران هەمیشە ناوی((ئازادی)) بەسەر ئازادی دەوڵەمەندەکان لە دەوڵەمەندبوون دادەنا، و لە سەر ئازادی کرێکاران، ئازادیان لە مردن بە برسییەتی. سەرمایەداران ناوی ئازادی رۆژنامەگەری بۆ ئازادی دەوڵەمەندەکان لە بەرتیلدان بە رۆژنامەکان و ئازادیان لە بەکارهێنانی پارەوپولەکانیان بۆ درۆ و تەزویرکردنی ئەوەی ناویان لێ ناو رای گشتی، بەکاردەهێنن. وجارێکی تر، دەبینین، ئەوانەی بەرگری لە



((دیموکراسی تۆخ)) دەکەن، هەڵدەستن بە بەرگریکردن لە سیستێمێکی زۆر بۆگەن و بەرتیلخۆر، سیستێمی دەستڕۆیشی دەوڵەمەندەکان بە سەر ئامرازەکانی رۆشنبیرکردنی جەماوەر، هەر خۆشیان زۆر فێڵ لە گەڵ دەکەن و بە رستەی جوان، درۆ لە ئەرکە مێژووییە هەستدارەکەی کە بریتییە لە ئازادکردنی رۆژنامەگەری لە کۆیلایەتی سەرمایە، لادەدەن. هەرگیز هیچ ئازادییەك راستەقینە و یەکسانییەکی راستەقینە نییە، تەنها لە سایەی ئەو سیستێمە کە کۆمونیستەکان ئێستا خەریکی دروستکردنین، کە دەوڵەمەندبوون لە سەر حیسابی غەیرە دەبێتە نەکار، توانای بابەتی بۆ ژێردەستەیی راستەوخۆ یا ناراستەوخۆی رۆژنامەگەری بۆ دەسەڵاتی سەرمایە، لە ناو دەچێ. هیچ شتێك نییە رێگری لە کارگەران بکا(یا کۆمەڵێ لە کارگەران گرنگ نییە ژمارەکەیان چەند دەبێ)لە وەرگرتن و پەیڕەوکردنی مافی یەکسان لە بەکارهێنانی چاپخانە گشتییەکان و وەرەقە کە موڵکی گشتە.

٩/ مێژووی سەدەی نۆزدەهەم و بیست، پێشی جەنگیش، پیشانی داین، واقیعی ئەم((دیموکراسی تۆخە))هەڵبەستراوە لە سێبەری سیستێمی سەرمایەداری چۆنە. مارکسیەکان هەمیشە دووبارەیان کردووەتەوە، کە دیموکراسی و (تۆخییەکەی)چەند گەشەی سەندبێ،ئەوەندە خەباتی چینایەتی توندوتیژتر دەبێ ودەسەڵاتی سەرمایەو دیکتاتۆری بۆرژوازی بەوپەڕی((ئازادی)) دەردەکەوێ. مەسەلەی دریفوس لە کۆماری فەرەنسا و سەرکوتکردنە خوێناوییەکان کە گروپە کرێگرتەکان پێ هەڵدەستن، ئەوانە سەرمایەداران چەکداریان دەکەن و بە گیان مانگرتوواندا، بەریان دەدەن لە کۆماری ئەمریکای ئازاد و دیموکرات،–ئەم راستیانەو هەزاران راستی وەك وان، ئەو راستیانەمان

بۆ دەردەخەن کە بۆرژوازی بەبێ هودەییی هەوڵدەدا بیشارێتە، ئەوەش ئەوەیە کە بە راست، لە دیموکراسیترین کۆماری دیموکراسی، تیرۆرو دیکتاتۆری بۆرژوازی بالأدەستە، بە ئاشکرایی رووخساری هەردووکیان دەردەکەوێت، کاتێ بەرخۆران وای بۆدەچن، دەسەلأتی سەرمایە دەرلەرزێ و دەکەوێ.

١٠/ جەنگی ئیمپریالیستی١٩١٤–١٩١٨بۆ دواپین جار، تەنانەت بە بەشی کرێکارە دواکەوتووەکانیش، پۆی راستەقینەی دیموکراتی بۆرژوازی، تەنانەت لە ئازادیتترین کۆمار، پیشان دا، بەوەی کە دیکتاتۆری بۆرژوازی لە پێناوی دەوڵەمەندبوونی کۆمەڵێك ئەلمان یا ئەنگلیزی خاوەن مەلایین یا ملیارد، دەیان ملیون کەس کوژران، ولە ئازادترین کۆمار، دیکتاتۆرییەتی سەربازی بۆرژوازی سەپێنرا. ئەم دیکتاتۆری سەربازییە هێشتا هەر ماوە، تەنانەت پاش دۆراندنی ئەلمانیا لە دەوڵەتانی ویفاق. رێك، جەنگ، زیاتر لە کەسانی تر، چاوی کارگەرانی کردەوە و بریقایی لە سەر رووی دیموکراتی بۆرژوازی هەڵماڵی و بە گەلێ، قەوارەی ئالوگۆر و قازانج لە کاتی جەنگ و بە هۆی جەنگ هەڵماڵی. بۆرژوا بەناوی((ئازادی و یەکسانی))بەم جەنگە هەستا، بەناوی((ئازادی و یەکسانی))بازرگانانی چەك و پێداویستییەکانی،سەروەتی ئەفسانەییان چنگ کەوت. هەموو هەوڵەکانی نیونەتەوەیی زەردی برن ناتوانێ لە جەماوەر پۆی سەرمایەگوزاری ئازادی بۆرژوا، یەکسانی بۆرژواو دیموکراسی بۆرژوا بشارێتەوە، کە تا کۆتایی ئاشکرایە.

١١/ لە ئەلمانیاشدا، پێشکەوتووترین وەلأتی سەرمایەداری لە کیشوەری ئۆروپا، یەکەم مانگەکانی ئازادی کۆماری کە تێکشکاندنی ئیمپریالیزمی ئەلمانیا هێنای، سرووشتی راستەقینەی کۆماری دیموکراتی بۆرژوازی، بە کرێکارانی



ئەلمانیا و هەموو جیهانی پیشاندا. تیرۆرکردنی کارل لیبخنت و رۆزا لۆکسمبۆرگ رووداوێکی مێژوویی جیهانی بایەخدارە، نەك تەنها بە هۆی مەرگی جەرگبڕانەی کە ئەم دوو رابەری ئینتەرناسیونالی کۆمونیستیە، کە بەراستی پرۆلیتارو باشترین نوێنەری بوون، بەڵکو لەبەر ئەوەیش کە تا کۆتایی ناوەڕۆکی چینایەتی یەکێك بە دەوڵەتە پێشکەوتووەکانی ئۆروپای دەرخست، و بۆ ئەوەی —بەبێ پێوەنان بگوترێ— دەوڵەتێکی پێشکەوتوو لە سەر ئاستی جیهان. گەر چەند کەسێك لە ئەفسەر و سەرمایەدارەکان پێیان کرا، خەڵکی زیندارکراو بکوژن، واتە لە ژێر پاراستنی دەسەلأتی دەوڵەتن، و کوشتنیان بە بێ سزادان، لە سەردەمی حکومەتێکی سۆسیال–نیشتیمانپەروەر، واتە لەو کۆمارە دیموکراسییە، کە ئەو جۆرە رووداوە تێدا ئەنجام بدرێ،دیکتاتۆرییەتی بۆرژوازییە. ئەوانەی بێزاری و مەحکومکردنی تیرۆری رۆزاو کارل پیشان دەدەن، بەلأم ئەم راستییە تێناگەن، هیچ پیشان نادەن غەیری گێلایەتی و دووڕوویيان. ((ئازادی))لە کۆمارێك لە ئازادترین کۆمار و پێشکەوتووترینیان لە جیهان، کۆماری ئەلمانیا، ئازادی کوشتنی رابەرانی پرۆلیتاریای زیندانیکراوە، ئازادی کوشتنیان بەبێ سزادان. بارودۆخەکە بە شێوەیەکی تر نابێ، تا سەرمایەداری بالأدەست بێ، چونکە گەشەسەندنی دیموکراسی، جڵەوی خەباتی چینایەتی ناگرێ، بەڵکو توندو تیژتری دەکات. ئەم خەباتە ئێستا گەیشتە پلەی کولأن بە هۆی هەموو سەرئەنجامەکانی جەنگ و کارتێکردنەکانی و عاقیبەتەکانی.

لە هەموو جیهانی شارستانییەت، پەنادەبەن بۆ دەرکردنی بەلشەفییەکان، جێ پێیان دەکەون و زیندانیان دەکەن، وەك لە سویسرا روودەدا(بۆ نموونە)کە

یەکێکە لە ئازادترین کۆمارە بۆرژوازییەکان، ولە ئەمریکا قەسابخانە رێکدەخەن بۆ بەلشەفیکەکان، هتد...بە پێی تێڕوانینی((دیموکراسی بە شێوەی گشتی)) یا ((دیموکراسی تۆخ))، دەبینین بەڕاستی شوێنی پێکەنینە، دەوڵەتانی شارستانی، پێشکەوتوو، سەرتاپا چەکدار، ترسیان لە چەند کەسێك هەیە لە رووسیای دواکەوتوو، برسی و وێران. لەو رووسیایە، رۆژنامەك بۆرژوازییەکان کە بە دەیان ملیون نوسخە بڵاودەکرێنەوە، پێدەڵێن وەحشی وتاوانبار هتد...بەڵگەنەویستە، ئەو بارودۆخە کۆمەڵایەتییە کە بوو بە هۆی گەشەسەندنی ئەو ناکۆکییە زەقە، لە راستیدا هیچی تر نییە غەیری دیکتاتۆری بۆرژوازی.

١٢/ لەم بارودۆخەدا، دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا نەك تەنها شەرعییە، وەك ئامرازێك بۆ روخاندنی سەرمایەکوزاران و وردخاشکردنی بەرگریان، بەڵکو پێویستییەکە ناکرێ دەستی لێ هەڵبگیرێ بۆ هەر کارگەرێك بەوەی کە تاقە ئامرازێکە بۆ بەرگریکردن لە دژی دیکتاتۆرییەتی بۆرژوازی کە جەنگی بەرپاکرد و جەنگی تریش ئامادە دەکات.

خاڵی سەرەکی کە سۆسیالیستەکان تێناگەن و کورت بینیان دەسەڵمێنی لە بواری تیئۆری و ژێردەستی تەوهومەکانی بۆرژوازی دەبن وسیاسەتی خیانەتکاریان لە ئاستی پرۆلیتاریا ئەوەیە کە ناکرێ شتێك هەبێ لە نێوان دیکتاتۆرییەتی بۆرژوازی ودیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا لە کۆمەڵگای سەرمایەداری کاتێ خەباتی چیناتیەتی تا پلەیەکی ترسناك کەڵەکە دەکا، کە لە ناو بنتەمەڵی ئەم کۆمەڵگایە هەیە. هەر خەونێك بە شتێکی سێهەم، تەنها هاوارێکی کۆنەپەرەستانەی خوردە بۆرژوانەیە.هەروا بەڵگە لەسەر ئەمە، ئەزموونی گەشەسەندنێکە زیاتر لە سەدەیەك خایاندو دیموکراتی بۆرژوازی و بزووتنەوەی



کرێکاری لە هەموو وەڵاتە پێشکەوتووەکان تێدا، تێپەڕی، و بە تایبەتی ئەزموونی ئەم پێنج ساڵە دواییە. هەموو زانستی ئابووری سیاسی و هەموو ناوەڕۆکی مارکسیزم فێرمان دەکەن، و حەتمییەتی دیکتاتۆری بۆرژوازی رووندەکەنەوە لە بواری ئابووری و لە گشت ئابووری کاڵایی، دیکتاتۆرییەتێکە ناکرێ شوێنی بگردرێتەوە، تەنها لە لایەن چینێك نەبێ، گەشەی پێدەدا، زۆری دەکا،گۆی دەکاتەوە و خودی گەشەسەندنی سەرمایەداری بەهێزی دەکا، مەبەستم چینی پرۆلیتاریایە.

١٣/ هەڵەیەکی تیئۆری و سیاسی تر هەیە، سۆسیالیستەکان تێدەکەون، ئەوەش ئەوەیە، تێناگەن کە شێوەکانی دیموکراسی لە ماوەی هەزاران ساڵ یەك لە دوای یەك هاتن، لە یەکەم تۆی لە سەردەمە کۆنەکان، بە قەد ئەوەی چینێکی باڵادەست، چینێکی تر شوێنی دەگرتەوە. لە کۆمارەکانی یونان کۆن، لە سەدەی ناوەڕاست و لە وەڵاتە سەرمایەدارە پێشکەوتووەکان، دیموکراسی شێوەی جۆراوجۆر بە خۆ دەگرێ و بە پلەی جۆراوجۆر دەگات لە جێبەجێ کردنی. زۆر هەڵەیە گەر لەو باوەڕە بین کە قووڵترین شۆڕش لە مێژووی مرۆڤایەتی، گواستنەوەی دەسەڵات بۆ یەکەم جار لە دەستی کەمایەتییەك لە خاوەن سەرمایە بۆ دەستی زۆربەی بەرهەمهێنەران دەبێ لە چوارچێوەی کۆن، چوارچێوەی دیموکراسی بۆرژوازی، پەرلەمینتاری کۆن ئەنجام بدرێ، بە بێ وەرچەرخانێکی ریشەیی، بە بێ نەشونماکردنی شێوەیەکی نوێی دیموکراسی و دەزگای نوێ بەرجەستەی بارودۆخی نوێ جێبەجێ کردنی بکا، هتد...

١٤/ دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا لە دیکتاتۆرییەتی چینەکانی تر دەچێ، بەوەی، وەك هەر دیکتاتۆرییەتێك لە پێویستی بەکارهێنانی هێز بۆ سەرکوتکردنی

بەرگری ئەو چینە کە کۆنترۆڵی سیاسی لەدەست دەچێ، سەرچاوەدەگرێ.
جیاوازی ریشەیی لە نێوان دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریاو دیکتاتۆرییەتی چینەکانی تر–دیکتاتۆرییەتی دەرەبەگەکانی سەدەی ناوەڕاست، دیکتاتۆرییەتی بۆرژوازی لە هەموو وەڵاتە سەرمایەدارە شارستانییەکان– ئەوەیە، ئەمانەی دوایی، بە هێزـ سەرکوتی بەرگری زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوان دەکەن، واتە کارگەران. بەڵام دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا، بە پێچەوانەوەیە، بە هێز، سەرکوتی بەرگری چەوسێنەران دەکات، واتە سەرکوتی کەمایەتییەك لە دانیشتیوان، موڵکدار عەقارییەکان وسەرمایەداران.کەواتە سەرئەنجام، دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا، نەك هەر دەبی بەرەو گۆڕانی شێوەو دەزگا دیموکراسییەکان بە گشتی بڕوات، بەڵکو بەرەو گۆڕانکارییەکیش، بتوانێ رێگا فراهەم بکا بۆ بەرفراوانکردنی بێ هاوتا لە جیهان، لە رەخساندنی بەکردەوەی دیموکراسی لە لایەن ئەو چینانە کە سەرمایەداران دەیانچەوسێنێتەوە، واتە لە لایەن چینە زەحمەتکێشەکانەوە.
و بەکردەوە، شکڵی دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا، کە لە واقیعدا داڕێژراوە، واتە دەسەڵاتی سۆڤێتی لە روسیا، سیستێمی شوورا لە ئەلمانیا، و Shop Stewards Committees و ئەوانی تر لە هاوچەشنی دەزگاکانی سۆڤێتی لە وەڵاتەکانی تر، واتای ئەوەی هەیە بە رێکورەوانی بۆ چینە زەحمەتکێشەکان، واتە زۆربەی دانیشتیوان، توانای عەمەلی دەرەخسێنێ بۆ چێژوەرگرتن لە ماف و ئازادی دیموکراسی. ئەم توانایە لە رابردوودا هەرگیز بە شێوەی لێك نزیکیشەوە لە باشترین کۆماری بۆرژوازی و لە هەموو دیموکراسیتر، نەبووە.



ناوەڕۆکی دەسەڵاتی سۆڤێتی گەڵاڵەکردنی لەوەدایە کە تاقە بنەما بەردەوا بۆ هەر دەسەڵات و ئامێرێکی دەوڵەتی، رێك رێکخستنی بەرفراوانی ئەو چینەیە کە لەلایەن سەرمایەدارانەوە دەچەوسێنەوە، واتە کرێکاران و نیمچە پرۆلیتاریەکان (ئەو جووتیارنە کە بەرخوری لە کاری کەسانی تر ناکەن و بە بەردەوام ناچارن لە لانی کەمەوە بۆ فرۆشتنی بەشێك لە هێزی کاریان). ئەم جەماوەرە کەوا لە گەڵ ئەوەی یەکسانی بە گوێرەی یاسا هەبوو، بە کردەوەو بە هەزاران فێڵ و کەڵەبازی لە بەشداربوون لە ژیانی سیاسی و بە کارهێنانی ماف و ئازدییە دیموکراسییەکان لە دیموکراتیترین کۆماری بۆرچوازیدا، دوورخرابوو. ئەمانە ئێستا پێشوازیان لێ دەکرێ بۆ بەشداربوون بە نەختێك بەردەوامی، ئەلزامی، و لابەلاکەرەوە لە بەرێوەبردنی ئیدارەی دیموکراسی دەوڵەت.
١٥/ یەکسانی لە نێو هاووەڵاتیان بە بێ جیاوازیکردن لە نێوان ژن و پیاو، ئاین، رەگەزو نەتەوە، ئەم یەکسانییە کە دیموکراسی بۆرژوازی هەمیشە لە هەموو شوێنێك بەڵێنی پێدەدا، بەڵام لە هیچ شوێنێك جێبەجێی نەکرد و بە حوکمی دەسەڵاتی سەرمایە، پێشی نەکراوە جێبەجێی بکا، دەسەڵاتی سۆڤێتی، واتە دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا بە بێ خاو بوو و بە شێوەیکی تەواو جێبەجێی دەکا، چونکە کەس ناتوانێ جێبەجێیان بکات، تەنها دەسەڵاتی کرێکاران نەبێ، کە هیچ بەرژەوەندییەکیان نییە، نە لە موڵکایەتی تایبەتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و نە لە ململاتی لە پێناوی دابەشکردن و دابەشکردنەوەی.
١٦/ دیموکراتی کۆن، واتە دیموکراتی بۆرژوازی و پەرلەمانییەت بەشێوەیەك رێکخراون، تا پێی بکرێ، خودی جەماوەری زەحمەتکێش لە ئامرازی بەرێوەبەرایەتی. بەڵام دەسەڵاتی سۆڤێتی، واتە دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا،

بەپێچەوانەوەیە، بە شێوەیەك ڕێكخراوە، جەماوەری زەحمەتكێش لە ئامرازی بەڕێوەبردن نزدیك دەكات و بۆ ئەم ئامانجە، كۆبوونەوەكانی هەردوو دەسەڵاتی تەنفیزی وتەشریعی لە ڕێكخستنی سۆڤێتی بۆ دەوڵەت هەوڵدەدات. هەروا بازنە هەڵبژاردنەكانی ناوچەكان بە یەكانی بەرهەمهێنان وەك شەركەت و كارگاكان بۆ نموونە شوێنیان دەگرێتەوە.

١٧/ سوپا تەنها ئامرازێك نەبوو بۆ چەوسانەوە لە سێبەری پاشادا، بەڵكو لە هەموو كۆمارە بۆرژوازییەكان، تەنانەت لەوانەی لە هەر هەموویان دیموكراتیترە، هەر وا مایەوە. تەنها دەسەڵاتی سۆڤێتە بەوەی ڕێكخستنی دەوڵەتی بەردەوامە بۆ ئەو چینانە كە لە ڕابردوودا لەلایەن بۆرژوازییەوە دەچەوسێنران،دەتوانێ ملكەچی سوپا بۆ سەركردایەتی بۆرژوازی لەناوببات. بەكردەوە پرۆلیتاریاو سوپا یەكبخات، وبە كردەوە چەكداركردنی پرۆلیتاریا بەدەست بهێنێ و بۆرژوازی چەك بكات، دەنا سەركەوتنی سۆسیالیزم مەحاڵە.

١٨/ ڕێكخستنی سۆڤێتی بۆ دەوڵەت بۆ ڕۆڵی سەركردایەتی پرۆلیتاریا ڕێكخراوە، بەوەی چینێكە سەرمایەداری چڕی كردووە و لە هەموو چینەكانی تر، زیاتر فێری كردووە. ئەزموونی هەموو شۆڕش و بزووتنەوەكانی چینە چەوساوەكان، ئەزموونی بزووتنەوەی سۆسیالیستی لە هەموو جیهان، فێرمان دەكەن كە تەنها پرۆلیتاریا پێدەكرێت بەشە پەرتەوازو دواكەوتووەكانی دانیشتیوانی زەحمەتكێش و چەوساوەكان ڕێك بخات و ڕابەرییان بكات.

١٩/ تەنها ڕێكخستنی سۆڤێتی بۆ دەوڵەت بە كردەوە پێدەكرێت، بە لێدانێك ئامێری كۆن، واتە بۆرژوازی، بیروكراتی و دادپەروەرییەكەی برۆخێنی و بۆ هەمیشە لە ناوی ببات. ئەمانە لە دیموكراتیترین كۆمار مانەوەو دەبوایە لە ژێر



سێبەری سیستێمی سەرمایەداری بمێننەوە كە لە ڕاستیدا تەگەرەیەكی گەورەیان پێكدەهێنا لە بەردەم ئەنجامدانی دیموكراسی بۆ كرێكاران و زەحمەتكێشان. لە پێناوی ئەمەدا، كۆمونەی پاریس هەنگاوە یەكەمە پڕ بایەخە مێژوویی جیهانییەكەی دانا و دەسەڵاتی سۆڤێتی دووهەم هەنگاوەكەی.

٢٠/ لەناوبردنی دەسەڵاتی دەوڵەت، ئەو ئامانجەیە كە هەموو سۆسیالیستەكان مەبەستیان بوو و لە وانە ولە سەرەوەشیان ماركس. بەبێ بە ئەنجام گەیاندنی ئەم ئامانجە، هەرگیز دیموكراتی ڕاستەقینە، واتە یەكسانی و ئازادی، جێبەجێ نابێ. تاقە ئامێری بەكردەوە بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، دیموكراتی سۆڤێتییە یا پرۆلیتاریایی، چونكە ڕێكخراوەكانی جەماوەری كارگەران بۆ بەشداری بەردەوام و ئیلزامی لە بەڕێوەبردنی دەوڵەت ڕادەكێشێ و یەكسەر دەستدەكات بە ئامادەكردنی لەناوچوونی هەموو دەوڵەت، لەناوچوونێكی تەواو.

٢١/ ئەو دۆڕاندنە تەواوەی ئەو سۆسیالیستانەی لە برن كۆبوونەوە، ڕووبەڕووی بوونەوەو تێنەگەیشتنی ڕەهایان بۆ دیموكراتی نوێ، واتە پرۆلیتاری، لەمانەی خوارەوە دەردەكەون: لە١٠ی/١٩١٩/٢برانتینغ كۆتایی بە كۆنگرەی جیهانی ئینترناسیونالی زەرد هێناو لە ١٩١٩/٢/١١ڕۆژنامەی ئەوانەی تێدا بەشدار بوون (دی فرایهایت—ئازادی) كە لە بەرلین دەردەچێ، بانگەوازێكی حزبی ((سەربەخۆكان))بۆ پرۆلیتاریا بڵاوكردەوە. ئەم بانگەوازە دان بە پۆی بۆرژوازی حكومەتەكەی شیدمان دەنێ و تاوانباری دەكا بەوەی دەیەوێت سۆڤیتات لەناو ببات(ئاڵاهەڵگری شۆرش و پارێزەری)وپێشنیار دەكات، سیفەتی شەرعی لەسەر سۆڤیتات و مافی ڕاگرتنی بڕیارەكانی كۆمەڵەی نیشتیمانی بداو خستنەڕووی مەسەلەكان لە ریفرندومێكی گشتی.

ئەم جۆرە پێشنیارە لە سەرنەکەوتنی فیکری تەواوە کە توشی ئەو بیرمەندانە هاتووە، ئەوانەی بەرگری لە دیموکراسی دەکەن بە بێ ئەوەی لە خەسڵەتە بۆرژوازییەکەی تێبگەن. ئەم هەوڵە خەندەئاورە بۆ مانەوەی سیستێمی سۆڤێتی، واتە دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریاو کۆمەڵەی نیشتیمانی، واتە دیکتاتۆرییەتی بۆرژوازی، هەتا دوایی هەژاری بیرکردنەوە لە لای سۆسیالیستەکان وسۆسیال-دیموکراتە زەردەکان پیشان دەدا. هەروا سرووشتی سیاسی کۆنەپەرەستانەیان بەوەی خوردە بۆرژوازین. سەرشۆڕی ترسنۆکانەیان بۆ هێزی دیموکراتی نوێ کە بە شێوەیەك گەشەی سەندووە، گەڕانەوەی بۆ نییە.

٢٢/ زۆربەی نیونەتەوەیی زەردەکەی برن ئەو جورئەتەی نەبوو، سەرەڕای مەحکومکردنی بەلشەفییەت، لە ترسی جەماوەری کرێکاران، بەڕەسمی دەنگ لەسەر بڕیارێکی گونجاو بدەن. لە تێڕوانینێکی چینایەتییەوە، رەفتارێکی درووستیان گرتەبەر. ئەو زۆربەیە لە گەڵ مەنشەفیك، سۆسیالیستە - شۆڕشگێڕەکانی رووسیا و لە گەڵ شیدمانییەکان لە ئەلمانیا هاوپشتی دەکەن. مەنشەفیکەکان وسۆسیالیستە-شۆڕشگێڕەکانی رووسەکان کە بێزارن بەهۆی ئەوەی لە لایەن بۆلشەفیکەکانەوە جێپێیان هەڵدەگیرێت، هەوڵدەدەن ئەو راستییە بشارنەوە کە ئەو جێپێ هەڵگردنە بەهۆی بەشداربوونی مەنشەفیك و سۆسیالیستە-شۆرشگێڕەکانە لە جەنگی ناوخۆ کە لە پاڵ بۆرژوازی ولە دژی پرۆلیتاریا راوەستان. لە ئەلمانیاشدا، شیدمانییەکان و حزبەکەیان بەڵگەیان دا بە دەستەوە لە سەر هەمان بەشداریکردنیان لە جەنگی ناوخۆ لە پاڵ بۆرژوازی و لە دژی پرۆلیتاریا راوەستان.



بۆیە زۆر سرووشتییە زۆربەی بەشداربووان لە نیونەتەوەیی زەردی برن مەحکومی بەلشەفیکەکان بکەن. ئەوەش بۆ بەرگری لە((دیموکراسی تۆخ)) نییە، بەڵکو بۆ بەرگری لە خۆکردن لە لایەن ئەوانەی کە دەزانن و هەستی پێ دەکەن، لە شەڕی ناوخۆدا لایەنی بۆرژوا دەگرن لە دژی پرۆلیتاریا. بۆیە هەر دەبێ، لە تێڕوانینی چینایەتییەوە، بڕیار بدەن لە سەر درووستی زۆربەی نیونەتەوەیی زەردەکەیان. لە سەر پرۆلیتاریاش ئەوەیە لە راستی نەترسێ، بەڵکو بەراستگۆیی رووبەڕووی ببێتەوە و هەموو ئەو سەرئەنجامە سیاسییانەی لێ دەردەچن، سوودیان لێ وەربگرێ

**هاوڕێیان!**

دەمەوێ هەندێ شت لە بارەی دوو خاڵی دوایی بۆ زیاد بکەم. پێموابێ ئەو هاوڕێیانەی تەکلیف کراون بە پێشکەشکردنی راپۆرتێك لە بارەی کۆنگرەی برن، بە دوور و درێژی باسی ئەم بابەتە بۆ دەکەن.

لە١٩١٩/٣/٦لە رۆژنامەی((پراڤدا))، ژمارە٥١و((ئەزفستیا فتسیك))ژمارە٥١ بڵاوکراوەتەوە

بەرگی ٣٧، لاپەڕە٤٩١-٥٠٩

تێبینی: لە گەڵ ئەم نووسینە، هاوڕێ لینین چەند خاڵێکی تر بۆ زیاد دەکا. لە کاتێکی تر ئەوانەیش وەردەگێڕم

## ئامۆژگاری ئامادەنەبوویەك

ڤلادیمیر ئیلیتش ئۆلیانۆف

ئەم دێڕانە لە٨ئەکتۆبەر دەنووسم، هیواشم بەوە نییە سبەی بە دەستی هاوڕێیانی پترۆگراد بگات. ڕەنگە دوابکەوێت، چونکە ڕۆژی١٠ی ئەکتۆبەر دیاریکراوە بۆ کاتی دامەزراندنی کۆنگرەی سۆڤێت لە باکور. لە گەڵ ئەوەشدا، هەوڵ دەدەم، ئامۆژگارییەکانم بدەم((ئامۆژگاری ئامادەنەبوویەك))، بۆ ئەوەی، لە پاشاندا، سوودی لێوەربگرن، ئەگەر بەم زووانە ڕاپەڕینی پێشبینیکراوی کرێکاران و سەربازانی پترۆگرادو هەموو((دەوروبەری))ڕووی دا، بەڵام ئەوە هێشتا ڕووی نەداوە.

ئەوە ڕوونە، کە دەبێ هەموو دەسەڵات بۆ سۆڤێت بگۆێزرێتەوە، و دەبێ بە هەمان ئەو ئەندازە، بۆ هەموو بەلشەڤییەك ڕوون ببێتەوە، کە مەزنترین سۆزو پشتگیری گەشبینانە لە نێو هەموو کارگەران وزەحمەتکێشانی جیهان وەردەگرن ، بە تایبەتی لەو وەڵاتانەی لە گەڵ یەکدا دەجەنگێن، وبە تایبەتی لە نێو جووتیارانی ڕووسیا. هەردوو ئەم خاڵانە زامنکراون بۆ دەسەڵاتی



شۆڕشگێڕی پرۆلیتاریا (یا بەلشەفیزم، ئەمە هەمان شتە ئەمڕۆ). ئەم دوو خاڵە، لە سەر ئاستێکی بەرفرەواندا پێزانراوەو دەمێکیشە چەسپێنراون و پێویست بە باسکردنەوە نین.

بەڵام دەبێ باسی خاڵێك بکەین، کەوا جێی گومانە، ڕوون بێت، لە تێڕوانینی هەموو هاوڕێیان، ئەوەش ئەمەیە: ئەمڕۆ، گواستنەوەی دەسەڵات بۆ سۆڤێت، واتە، بە کردەوە، ڕاپەڕینی چەکدارانە. ئەوە مەسەلەیەکی بەڵگەنەویستە، بەڵام تا ئێستا، هەموو، بە گوێرەی پێویست لێی وردنەبوون و لێی وردنابن. ئێستا وازهێنان لە ڕاپەڕینی چەکداری، واتە وازهێنان لە دروشمی سەرەکی بەلشەفیزم (هەموو دەسەڵات بۆ سۆڤێت) وبە گشتی لە هەموو ئینتەرناسیونالی پرۆلیتاریای شۆڕشگێڕ.

بەڵام ڕاپەڕینی چەکدارانە شێوەیەکی تایبەتە لە شێوەکانی خەباتی سیاسی، ژێردەستی یاسای تایبەتە، کە دەبێ بە وریاییەوە تێ بڕوانین. کارل مارکس بە ڕوونییەکی دەگمەن ئەم بیرۆکەیەی دەربڕیوە کاتێ نووسی ((ڕاپەڕین))ی چەکدارانە((هونەرێکە وەك جەنگ)).

فەرموون، ئەمەش هەندێ لەو ڕێسا سەرەکییانەیە کە مارکس لە بارەی ئەم هونەرە دایڕشتووە:

١/ هەرگیز نابێ یاری بە ڕاپەڕین بکەین، کاتێ دەستی پێدەکەین، دەبێ بڕوای بتەومان هەبێت بەوەی کە پێویستە تا کۆتایی بڕۆین.

٢/ کۆکردنەوەی هێزێك، زۆر لە هێزی دوژمن زۆرتر بێت، لە شوێن و چرکەی بڕیادەر، دەنا دوژمن شۆڕشگێڕان لەناو دەبا، چونکە ئامادەیی لەوان باشترە و ڕێکخستنی ڕێکوپێکترە.

٣/ كه راپەڕین دەستی پێکرد، دەبێ بەوپەڕی سووربوون کار بکەین و بە بێ چەند وچۆن، بگوێزینەوە، هەر چۆنێك بێ، بۆ هێرش کردن. ((بەرگری مەرگی راپەڕینی چەکدارانەیە)).

٤/ دەبێ هەوڵ بدەین، لە پڕێکدا هێرش بکەین و سوود لەو ماوەیە وەربگرین کە هێزەکانی پەرتەوازە.

٥/ دەبێ هەموو رۆژێك سەرکەوتن بە دەست بهێنین، گەر بێ نرخیش بێ (دەتوانین بڵێین: هەر سەعاتێك، کاتێ مەسەلەکە بەیەك شارێك پەیوەست دەبی)، لەگەڵ پاراستنی ((سەرکەوتنی مەعنەوی)) بە هەموو نرخێك.

مارکس، وانەکانی هەموو شۆڕشەکان لە بارەی راپەڕینی چەکدارانەوەی بە ووشەیەك کورتکردەوە(دانتون کە گەورترین مامۆستای تەکتیکی شۆڕشگێڕانەیە لە مێژوو: زاتکردن، سەرلەنوێ زاتکردن، هەمیشە زاتکردن)).

گەر ئەم ووتەیە لە١٧ی ئەکتۆبەردا بە سەر رووسیا جێبەجێ بکەین، ئەوا مانەی ئەوەیە: دەبێ لە یەك کاتدا، هێرشبردن بە سەر پترۆگراد، بەوپەڕی دەسبردی و بەپەلە، لە دەرەوەو لە ناوەوە، لە گەڕەکی کرێکارەکان و لە فینلەنداوە، لە رفل و کرۆنشتاتەوە، هێرش بە سەر هەموو پاپۆڕەکان بکەین، هێزێك کۆبکەینەوە کە زۆر زیاتر بێ لە هێزی((پارێزەرانی بۆرژوازی)) (قوتابییەکانی قوتابخانە سەربازییەکان) و((هێزی فندی)(بەشێك لە قۆقان)،...هتد کە ژمارەیان دەگاتە١٥و٢٠هەزار پیاو(رەنگە لەوەش زیاتر بن).

دەبێ هەر سێ هێزە سەرەکییەکەمان رێك بخەین: پاپۆڕەکان، کرێکاران و یەکانە سەربازییەکان، بە شێوەیەك کە بەهەر نرخێك بێ و زیانەکان هەرچەند



بن، داگیر بکەین و بیانپارێزین:١/سەنتراڵی تەلەفۆن٢/ کارەبا٣/وێستگای شەمەندنەفەر٤/ پردەکان، ئەمیان بە پلەی یەکەم.

دەبێ جەسوورترین کەسەکان هەڵبژێرین((هێزی رووبەروو بوونەوە))، کرێکارە لاوەکان و باشترین دەریاوان) و لەمانە مەفرەزەی بچووك پێکبهێنین، ئەرکی داگیرکردنی هەموو خاڵە گرنکەکان پێ بسپێرین و لە هەموو شوێنێکیشدا بەشداری بکەن، لە هەموو ئەکتسیونە گرنگەکان، بۆ نموونە: گەمارودان و دابڕاندنی پترۆگراد و داگیرکردنی بە هێرشبرنی لە بار، لە لایەن دەریاوان، کرێکاران و یەکانە سەربازییەکان،—ئەم ئەرکە پێویستی بە هونەرو زاتکردنی سێ بارەوە هەیە.

دەبێ مەفرەزەگەلێك پێکبهێنین کە باشترین کرێکار لە ریزەکانی بێت و بە تفەنگ ونارنجۆك چەکدار بن و هێرش بۆسەر((ناوەندەکان))ی دوژمن (قوتابخانە سەربازییەکان، کارەبا و تەلەفۆن، ...هتد) بهێنن و لە ژێر درووشمی : تا دوا کەسمان دەمرین و ناهێڵین دوژمنان تێپەڕن) گەمارووی بدەن.

هیوامان وایە، هێزەکان سەرکەوتووانە، راسپاردەکانی دانتۆن و مارکسی مەزن جێبەجێ بکەن، ئەگەر بڕیاری راپەڕین درا. سەرکەوتنی شۆڕشی رووسیا و جیهان لە سەر دوو یا سێ رۆژ لە خەبات راوەستاوە.

لە ٨ئەکتۆبەر١٩١٧ نووسراوە.

یەکەم جار لە٧/نۆڤەمبەر١٩٢٠لە رۆژنامەی پراڤدا، ژمارە٢٥٠بلاوکراوەتەوە

جلدی٣٤، لاپەڕەی٣٨٢–٣٨٤

لە زمانی عەرەبییەوە، جلدی٧، لاپەڕەی٣٢٣–٣٢٦

٢٠٠٢/٦/١٣

تێبینی: تکایە هەر نوقسانی یا هەڵەیەك دەبینن، ئاگەدارم بکەنەوە، بۆ ئەوەی بۆ کاتی لە چاپدانی هەموو بەرهەمە وەرگێڕاوەکانی مارکس و ئەنگلس و لینین لە تۆی کتێبێکدا، بە کەمترین هەڵە بڵاوبکرێنەوە. هاریکاریتان جێگای ڕێز و سوپاسە.



i ویفاقی سێ قۆڵی پێکهاتبوو لە بریتانیا، فەرەنسا و روسیا و لە ١٩٠٧پێکهات. هاوپەیمانانی سێ قۆڵی پێکهاتبوو لە ئەلمانیا، نەمسا–مەجەرستان و ئیتالیا و لە ١٨٧٩–١٨٨٢پێکهات. (بە کورتی)